# موناجات

## هەژار

ئیلاهی تۆ بەزاتی زولجەلالت
خودا تۆ بەو سیفاتی بێ میسالت
بە هەققی ئەوکەسەی فەرمووتە «لەولاک
نەبوو مەتلەب کە بیکەم خەلقی ئەفلاک»
حەبیبە و مەحرەمی سیڕڕی نیهانت
موحەممەد خاتەمی پێغەمبەرانت
رەسوول ئەستێرەن و ئەو ئافتابە
لە عوقبا بۆ شفاعەت ئەو حیسابە
کە بێتە بەخشش ئەو دەریای جوودە
پڕیشکێکی بەسە هەرچی وجوودە
هەموو ئاحادی ئەوسافت کرووره
سەهووم کرد یارەسوڵ اڵلە ببووره
بە زیللی وەسفی تۆ ناگا دەسی کەس
سەنای تۆ و نەعتی تۆ قورئان دەڵێ وبەس
بە فەیزی حەزرەتی بووبەکری سەددیق
کەئەفزەل پاش نەبی ئەوبوو بە تەحقیق
بەگشت ئیمانی ئوممەت نزم و بەرزی
کەفەی ئیمانی هەڵنابڕن لە عەرزی
کە دۆخی شیری بۆ کفرێ نەبا سەد
کەمێ مابوو مسولمان ببنە موڕتەد
بەروشدی حەزرەتی مەحبووبی وەهاب
خەلیفەی سانی یەعنی ئیبنی خەتتاب
خەلافەت بوو بە تەشریفی عومەر نەو
عەبایەک بوو عەدالەت هاتە بەر ئەو
لەسەر باش گەر نەبوو ئەحکامی جاری
نیدایی ئەلجەبەل چۆن گەیە ساری ؟
دەفەرموێ ئەو کەسەی خەیرولبەشەر بوو
لەدووی من گەر نەبی بووبا عومەر بوو
بە ئازەرم و حەیای عوسمانی عەففان
تنۆکێکە لەوی سەد بەحری عەممان

بە سەعی وهیممەتی قورئانی کۆ کرد
رێگایی دینی تەخت وبێ کلۆ کرد
لە روح بورد نەک لەقورئان بەسیەتەشریف
فَسَيَكْفِيكَهُمْ بۆی بوو بە تەعریف
بە هەققی دەرکی شاری عیلم و جەوهەر
عەلی موشکیل گوشایی دەرکی خەیبەر
نەبی فەرمووی کەسی مەولای ئەمن بم
هومێدی بۆ تکای ئەولای ئەمن بم
دەبێ حوببی عەلی جێکا لە دڵدا
لەسەر دڵ دەرکی بوغزی ئەو قفڵ دا
بە هەققی ئال وبەیتی پاک وخاوێن
کە ئالوودە نەیان بوو چاک و داوێن
بکە روحمی بە من بەس رووسیاهم
بدە دەورەی سیاهی هەر گوناهم
بە فریادم بگە مەغشووشە حاڵم
بەخۆڕایی سەرف بوو ماه و ساڵم
نەشێوی تاعەتێکم بۆ بڕاوە
نە تۆوی چاکەیێکم بۆ چناوە
نیە خۆشی هومێدێکم بە شینی
نیە رووشم کە بچمە خووشەچینی
لە بەردم داوە شیشەی نام و نەنگم
لە خەرمانی عەمەل هەر بابە چەنگم
تەواوی عومری خۆم سەرفی هەوا کرد
هەتا خۆم بابە چەنگ وبێ نەوا کرد
لە ناکاو هەربینا وەختی سەفەر هات
ئەوەی لێی غافڵم گورجم بەسەر هات
عبوورم چۆن ئەبێ من لەو سنووره
کە تێشووی لازمە ئەو رێگە دووره
نیە تێشووم لە رێگا یا مزڵگا
مەگەر لا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللّٰه
گەدایەکم لە دەرکی کیبریاییت
ئەمن موفلیس ئەتۆش خۆت وخودایت
بە مستە خۆڵەمێشێکم جەهەننەم
نە تۆزی زیاد، نەیەک زەررە دەبێ کەم
کە بێ ئەنوا لە دەشتی مەحشەرا بم
لە عەفوت دا توفەیلی ئەولیابم
بکە روحمی بەمن زومرەی روحم بەر
لە دەرکی تۆ بەدەر نیمە پەنادەر
ئیتر من هەر بەمە ئومێدەوارم
کە تۆ نێوت کەریمە و من «هەژارم»

# نێوەرۆک



وێنەی
رووبەرگ
شوێنەواری مێژوویی
تاق بوستان

وێنەی
پشت بەرگ
کۆلی تاق بوستان



بەناوی خوا

## سەروتار

هاورێی سڵاو لەخوێنەرانی بەڕێز :

لە ژمارەی پێشوودا باسی ئەوەمان کرد کە"هەر چەشنە تێکۆشانێک بۆ سەرکەوتن پێداویستی بە بناغە و پایەی بەهێز و هاندەر هەیە. تا ورەی بەرزی خۆراگری وئازایەتی و خۆبەخت کردن لە تاکە تاکەی نەتەوەدا بخولقێنێ." هەروەها لەوتاری پێشوودا نەخشی دژایەتی زاتی و کارامەیی مەسەلەی نەتەوا ـ یەتی مان بەرامبەر بە ملهوڕی وزۆرداری جیهانی هێنا بەرباس ولێکۆلینەوە. ئێستا لەو ژمارەدا لەسەر باس وبابەتێکی بنەڕەتی دیکە دەدوێین .

**بیروباوەڕ و بایەخە ئایینی یەکان**

بێگومان بە درێژایی مێژوو هەرگیز هیچ هانەیەک لە پێک هێنان وهەڵسوڕاندنی ئاڵ و گۆڕی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا لە بیروباوەڕی ئایینی بەهێزتر نەبووە.

**مەکتەبێک کەبتوانێ لە سەرەتاوە ئینسان دژی خۆی راست کاتەوە دەتوانێ لە تاکە تاکەی کۆمەڵ سەربازی وا دروست بکا کە کاخی ستەم وێران بکا و ریشەی زوڵم هەڵکەنی وبۆ بەرەنگاری هەرهێزێک هەرچەندیش گەورە بێ لە جیهاندا بێتە مەیدان و سەرکەوێ...**

ئایین زیاتر لە هەموو شتێک دەتوانێ ببێتە هۆی ئاڵ وگۆڕ یا ڕاگرتن و پەرەگرتنی نیزامی کۆمەڵایەتی. هەر ئەوەش بۆتە هۆ کە حوکماتی ریاکار و درۆزن بۆ پاراستنی خۆیان لە لیباسی ئایین کەلک وەرگرن . ئەو رژیمە درۆزن ونارەوایانە خەڵکیان بە بۆچوونی بەرواڵەت ئایینی و دەکار هێنانی دەغەڵکارانەی ئەحکامی کۆمەڵایەتی ئائین فریو دەدا و خۆیان بە جل وبەرگی لایەنگری لەئائین و دین دەڕازاندەوە. بەو شێوەیە پێشگریان لە جووڵانەوە و هەستانی وێکڕایی خەڵک دەکرد. لەم راستایەدا **"تاغووتەکان وفیرعەونەکانی زەمانە تێدەکۆشان کەئایین لە نێوەرۆک بەتاڵ کەن و رواڵەتی راستین وشۆڕشگێڕانەی پێوە نەهێڵن وخۆیان لە تەوژمی* شۆڕشگێڕانەی بپارێزن و بە لایەکی دیکەش دا هەر بە هۆی ئایین سواری ملی خەڵک بن وفریویان بدەن ."**

ئەو باسە دوورو درێژە و چی دیکەی لەسەرنارۆین وتەنیا ئەوەندە دەڵێین کە هەموو حکوومەتێک (بە تایبەتی پاش سەدری ئیسلام) لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا کەلکیان لەم سیاسەتە وەرگرتووە..

ئەمڕۆ بایەخە* بەرزەکانی ئایین زیندوو بوونەوە و جل وبەرگی کۆنەپەرستی و خوڕافاتیان لەبەر خۆ داڕنیوە. شەریعەتی پاک و گیانبەخشی محەممەدی (د.خ) کە زۆر لەمێژ ساڵ بوو بەرەو فەرامۆشی دەرۆیشت ئەورۆ دەیەوێ کاروبار بەدەستەوە بگرێ .

**"لاچوونی تۆز و غوباری فەرامۆشی لەسەر چیهرەی قورئان وهاتنەوەگۆڕی بایەخەکانی لە کۆمەڵگادا بۆتە هۆی هەستان وخرۆشانی شەپۆلی " ئیسلام ویستی" لەمەڵبەندی هەنجیر و زەیتوون (تین و زەیتوون) و وڵاتە موسوڵمانەکانی دیکەدا و دووبارە هێز و شەوکەتی دەوڵەتی ئیسلام خەریکە سەرهەڵداتەوە"**

مەکتەبی دژ بە بوتی ئیسلام کە بۆ سەقامگیر کردنی فەرمانی ئیلاهی لە لایەن خاتەمی پێغەمبەرانەوە پێشکەش بەکۆمەڵگای ئینسانی کراوە لە ناخی دەروونی خۆیدا لەگەڵ هەموو رژیم و دەسەڵاتداری یەکی غەیرە ئیلاهی دژایەتی هەیە و بەگژی دادەچێ . باوەڕ و بڕوای خەڵک بەو ئایینە پیرۆزە دەبێتە سێڵاوێکی بەهێز وتەوژم. کە تۆماری ژیانی پیس وچەپەڵی زۆرداران وفریودەران وئەو کەسانەی لە خەڵک بوونە مۆتە و رموو*زن دەپێچێتەوە و بەرەی ئادەمیزاد رزگار دەکا . ئەم تۆفانە لەپێشدا دەبێتە هۆی ئاڵ وگۆڕی قووڵ وهەراو لەدەروونی لایەنگرانی خۆیدا. دەبێتە هۆی بێداری و خۆ خاوێن کردنەوە وتووڕهەڵدانی نەفسی چەپەڵ وئامادە بوون بۆ خەبات و خۆ بەخت کردن لەرێگەی حەق و عەدالەتدا .ئادەمیزادێک کە گەیوەتە ئەو پلەیە بەرەودوژمن ، بەرەوپێش بەرەو سەرکەوتن دەڕوا .. ناخەجڵێ ،ناترسێ و ناپرینگێتەوە. مردن بۆئەو ژیانە. فریشتەی رەحمەت دەگرێتە ئامێز ولە ماڵی هەتایی دا بۆی دادەنیشێ وپاڵ دەداتەوە.

"مەکتەبێک کە بتوانێ

**له سه‌ره‌تاوه ئینسان له دژی خۆی راست کاته‌وه، ده‌توانێ له تاکه تاکه‌ی کۆمه‌ڵ سه‌ربازی وا درووست بکا که کاخی سته‌م وێران بکا و ریشه‌ی زوڵم هه‌ڵکه‌نێ وبۆبه‌ره‌نگاری هه‌ر هێزێک (هه‌رچه‌ندیش گه‌وره بێ) له جیهاندا بێته مه‌یدان وسه‌رکه‌وێ...."**

به‌ڵێ باوه‌ڕ به‌مه‌کته‌بی به‌رزی ئیسلام وده‌کارهێنانی بایه‌خه‌کانی سه‌عاده‌ت هێنی ده‌توانێ گه‌وره‌ترین هێزی دژی زۆردارانی جیهانی له شه‌ڕێکی خه‌ست وته‌واوعه‌یاردا پێک بێنێ. ئه‌و شه‌ڕه هه‌میشه بووه وتا کۆتایی پێ هێنانی ده‌سه‌ڵاتداری سته‌مکار له گۆڕه‌پانی جیهاندا هه‌ر ده‌مێنێ.

"سه‌رکه‌وتووبن"

با سلام به خوانندگان محترم

در شماره پیش ضمن طرح این مطلب که " هر جنگ ومجاهده پیروزی نیازمند مبنایی قوی،استوار وانگیزه ساز است تاروح مجاهدت وپایداری وسلحشوری وشهادت طلبی را در آحاد ملت " بدمد نقش تعیین کننده دو عنصر مهم تزاحم ذاتی و ارزشهای قومی و ملی را در مقابلهٔ فراگیر وجدّی با استکبار برشمردیم.اکنون درباره نقش مبنایی دیگری به بحث مینشینیم .

**اعتقادات وارزشهای مکتبی**

بی شک در طول قرون واعصار، هرگز انگیزه‌ای قویتر ازاعتقادات مذهبی در شکل گیری تحولات سیاسی اجتماعی و....وجود نداشته است . عمق اثر و نفوذ مبانی عقیدتی و تعیین کننده. بودن آن در تغییر و یا تثبیت شرایط، موجب میگشت تا همواره‌حاکمیتهای نامشروع نیز برای حفظ موقعیتهای خود از پوشش مذاهب تحریف‌شده بهره جویند. بدین صورت که با استناد به‌تحلیلهای ناصحیح و درعین حال فریبنده و ظاهرالصلاح ازاحکام اجتماعی مذاهب ،حکومتهای خود را موجه نشان داده وبا خلع سلاح مذهب وارزشهای دینی از مخالفین ،امکان برپایی نهضتها وقیامهای فراگیر و عمومی را منتفی میساختند. دراین راستا **"تمام تلاش طواغیت و فرعونها این بود که با مسخ چهره حقیقی وانقلابی مذاهب نه تنها از تهدیداتش دراما ن بمانند بلکه از آن به‌عنوان وسیله‌ای موثر در سواری خوردن از مردم استفاده وافر ببرند".**

بحث در این باره به درازا کشیده واز حوصله مطلب خارج است . دراین رابطه به‌این جمله اکتفا میشود که‌یک تحقیق مختصر از تاریخ نشان میدهد که تمامی حکومتها ( بویژه حکومتهای پس از اسلام در سرزمینهای اسلامی) بگونه‌ای ازاین شیوه بهره جسته‌اند.

ارزشهای والای دینی، امروز دوباره احیا شده و لباس خرافه و اوهام از تنش خارج میشود. شریعت پاک و حیاتبخش محمدی(ص) که در طول سالها وقرنها در عرصه اجتماعی به فراموشی سپرده وجز آداب و سنن فردی وشخصی چیزی از آن مطرح نمیشد، امروز دوباره مدعی حکومت و قدرت شده است .

**"زدودن غبار فراموشی از چهره تابناک قرآن و طرح دوباره ارزشهای اصیل آن دربین مردم، موجب گردید تا در طول دهه اخیر موج اسلام خواهی و اسلامگرایی سرزمین تین و زیتون وبلاد دیگر اسلام را**

**فراگرفته وقدرت و شوکت و هیبت و دولت اسلام دوباره ظهور کند."**

مکتب اجتماعی وحکومتی اسلام که اصولا" برای استقرار نظام الهی و حاکمیت احکام خدا ونفی معبودها والهه‌های جعلی و بتهای جهل وخرافه ومظاهر شرک ونفاق ،ازسوی حضرت حق وتوسط مشعلدار اول و آخر، بزرگ مرد همه اعصار وقرون وعصاره خلقت و آفرینش ،حضرت ختمی مرتبت پیامبر عظیم‌الشان اسلام (ص) به جامعه بشری هدیه گشت، بنا به‌ماهیت وجودیش با همه حکومتهای غیر الهی در ستیز است . اعتقاد به این مکتب و پایبندی و پیروی از ارزشهای بیدارگر و هشیارکننده‌اش هرچند که قلب هر انسان آزاده و شریفی را چون نسیمی ملایم‌ولطیف مینوازد، لکن چون این نسیمها بهم برسند طوفانی بپا کنندکه تا مرگ محتوم همه بت پرستان وشیطان صفتان زورگو وستمکار و تادرهم پیچیده‌شدن تومار حیات ننگین جباران و عوامل ارعاب جوامع انسانی ومردم فریبشان ،فرونخواهد نشست. این طوفان در ابتدا درون پیروانش را چنان دگرگون میسازد که علیه نفس اماره خویش بشورندو بر میل حیوانی خویش بتازند. از خواب غفلت برخیزند و اسماعیلهای وابستگی را در پیشگاه خدایشان ذبح کنند وآنگاه با قلوبی پاک و باصفا و سیرت وضمیری منور وبی ریا همانندم که سر بر خاک سایند و در نزد رب ذوالجلالشان به‌خشوع و خضوع ،تضرع وانابه کنند با شمشیری شکسته، فرشهای ذربافت کاخهای ستم را از هم بدرند و چون آنانکه جمجمه‌هایشان را به‌امانت به خدا سپرده‌ودندانهایشان را محکم برهم میسایند، از هر سوی بر دشمن بتازند، بکشند و کشته شوند ودر هرصورت فرشته رحمت و حور نعمت را در آغوش گیرند و برای ابد و جاودان در منزل جلال و کمال ماوی گزینند .

**چنین مکتبی که بتواند درگام اول هر انسانی را علیه خودش بشوراند وچون تطهیرش کرد از وی، سربازی شجاع وجسور ودلاوری بی مانندومثال سازد تا بساط جور رابرچیده وبنیان ستم را ازریشه برکنده‌و بر ظالمین خصم‌وبر مظلومین پشتیبان باشد،میتواند برای جنگ باهر قدرتی هرچند بزرگ درجهان قد برافرازد وفریاد اَلاَرُجل وندای هَل مِنْ مُبارِز سر دهد**

**چنین مکتبی که بتواند در گام اول هر انسانی را علیه خودش بشوراند و چون تطهیرش کرد از وی سربازی شجاع و جسور و دلاوری بی همانند و مثال سازد تا بساط جور را برچیده و بنیان ستم را از ریشه برکنده و بر ظالمین خصم وبر مظلومین پشتیبان باشد، میتواند ( وصد البته میتواند) برای جنگ با هر قدرتی ( هرچند بزرگ) در جهان قد برافرازد و فریاد اَلاَرُجل وندای "هَل مِنْ مُبارِز سر دهد....."**

آری اعتقاد به مکتب حیاتبخش اسلام وپایبندی و ایمان به‌ارزشهای والا و سعادت آفرینش میتواند به عنوان مهمترین عنصر و بزرگترین عامل موثر،مبنای یک جنگ تمام‌عیار با استکبار باشد. جنگی که در آن مدت ،مکان، سلاح و نفر نقشی اثباتی و یا سلبی ندارد. جنگی که همیشه بوده، هست و تا پایان روزگار حاکمیت ظلم و ستمکاران در پهندشت گیتی خواهد بود.

"خدا نگهدارتان"

ئەم وتارە ئەحمەدی حەواری نەسەب لەکتێبی نورالاسلامی ماموستا مەلا کەریمی مودەریس وەدەری ناوە و بۆی ناردووین .

ئەگەر کەسێک بلێ بەرجی ئەم باسەی سەرو و ئەوین بەهیچ شتێکی دیکە پێک نایە ؟ لەبەر چی وادەلێ ؟

جواب ئەوەیەکە ئەوینی ئینسانێک سەبارەت بە یەکی دیکە بەهۆی ئۆگری و دلبەندی خزمایەتی یاخۆ شاگردوماموستایی یا بەرژەوەندی ژیان وەک کشت و کال و مامڵە وکار وتێکوشانەوەیە وزۆر کەس

دەبێ ئیمان بەوە بێنین کە ناردنی پێغەمبەران لوتفێکە کە خوا دەرهەق بە بەندەگانی خۆی کردووە ووەک رەحمەتێکە بۆ کۆکردنەوەی بیری پرژوئالۆز وگرشە دارکردنی ئەوان بیران بە نووری ئیمان و عیرفان ورێنوێنی یان بەزەو بیرورای راست و کردەوە و خووخدەی بەرزە.

دیسان دەبێ ئیمان بەوەش بێنین کە ئینسان زۆر پێداویستی بە کەلک وەرگرتن لەم مەبەستە هەیە کە بۆخۆی بە چەند هۆی سەرەکی پێک هاتووە وەک :

**دەلیلی نیزام :** لە لایەکەوە ئەگەر ئینسان کەمێک بیر بکاتەوە بۆی دەردە-کەوێ کە پێویستی بە کۆمەڵ هەیە وبە تەنێ ناتوانێ بژی و شێوازی ژیانی مەدەنی یە وبێ نیزامی گشتی و زاکوونی جامع ومانع ناتوانێ درێژە بە ژیان بدا. دەبێ ئەم نیزامە لەبەرچاو بگیرێ و ئەم لەبەرچاو گرتنەش پێویستی بە ئەوینی ئەم ئینسانە کەوتووە کە لەبەر چاوی دەگرێ چون هەر ئینسانێک وەک شوانی ئاگا دەبێ ئاگای لەئینسانەکانی دیکە بێ . چۆن شوان لەبەرامبەر مەڕدا بەرپرسە وئەگەر بە ئەوینەوە کار نەکا ناتوانێ بیپارێزێ. جا لەبەرچاو گرتنی زاکوون و قانوونیش بۆ ئینسان مەیسەر نابێ مەگەر ئەوە ویستی ئینسان بێ و لە کردەوەی باش وپەسندی ئەو سەرچاوەی بگرێ و بەرهەمی لەبڕان نەهاتووی دونیای ئەم لایە.

ئەم ئاواتە بۆ مەیل وهەوای دونیا زۆر نالوێ وبەشی زۆری بۆ قیامەتە . ئەم ئاواتانە لە بەرهەمی رێنوێنی پێغەمبەرانی مەزنە. جا کەوابوو ئینسان پێویستی بە رەسالەت وپێ سپێراوی ئەوان هەیە.

کە وێدەچێ بەپێی ئەسڵ وقاعیدە ڕێکیان بخا .

کەسێک دەپرسێ کە بۆ ئەوە پێویستی بەدین هەبێ لە زۆر وڵاتدا قانوون و نەزمی جیهانی دادەمەزرێ وئەم ئەوینەی باسمان کرد پەیدا دەبێ .

جا لە وڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێین هەروەک دەبینین ئەم دڵبەندییە کورتە و زۆر ناخایەنێ و لە چوارچێوەی نیشتمانێکی دیاری کراو لانادا .کەچی ئەو ئەوینەی مەبەستی ئێمەیە دەربەستی زەمان و مەکان ونەتەوەیەکی تایبەتی نیە بەڵکوو ئەوینێکە خەڵک لەسەرچاوەی واحید وخودای واحید ونیزامی واحید پەیوەند دەکا وئەم پێ سپێراوی یەش بەرجی نیزامی پێغەمبەرەتی بەهیچ جۆر پێک نایە

بە کوردی ئەوینێک کە بەرهەمی قازانجی کەموبەرچاوی ژیانی ئینسانە ناتوانێ وەها دەورێکی ببێ کە هۆی خۆبەخت کردن وفیداکاری دڵبەندانەی بێجگە لە چەندکەسی دیاری کراو. بەڵام ئاواتی بەختەوەری بێ بڕانەوە و رەحمەتی خوا لە هەر نەفسێکدا جێ بکاتەوە هەموو شت دەگرێتەوە وئەم دنیایە وبایەخەکانی ئەو بە هەموو تایبەتی خۆیەوە بێ بایەخ دەکا .

**هۆی شۆق و ترس**

بەڵگەی پتەو وقایم سەلماندوویەتی کە ئینسانی ژیر لەخۆڕا هیچ کارێک ناکا مەگەر لە ترسان یا بە هۆی دڵبەندییەوە. یانی یا لەبەر تەماحە یا لەترسان کە ئەمانە دوو پایەی شارستانەتی ئینسانن. واتە ئینسان چاکە وخراپەی بەم دوو مەبەستەیە. کەوابوو چاوی لە ماڵ و گیان و ئابڕووی خەڵک نیە. لە ترسی ئەوە کە نەکا تۆڵەی لێ بکرێتەوە .

کە لەم دڵبەندییانەدا هاوبەشن بۆ هەرێمی یەکدی دەست درێژ ناکەن وەک ڕێبواری نامۆ ودوورە وەتەن یا هەتیوی بێ یار وهانادەر یا بیوەژنی شوو مردو یا لاوێکی ناهومێدی نێوکۆمەڵ ویا نەخۆش و هەژاری موسڵمان لە وڵاتی دەرەوە و ڕێڕەوانی غەیرەدین وپەنا بردەکان .

بەڵام ئەوینێک کە سەرچاوەکەی ئیسلام بێ ئەوینێکی جامعە بۆ گەیشتنی هەر ئینسانێک بە ئینسانی دیکە لەوکارانەدا

واش هەیە بۆبارەکەڵای گشتی یا گەیشتن بە ماڵ ومەقام وشتی وا کارێکی دژوار دەکا . کەوایە جگە لەم دوو هۆیە شتێکی دیکەش لێرەدا نادیارە یانی بۆ ئەوە بترسێ یا تەماحی نیعمەت وبەختەوەری هەبێ ئەم کارەی کردووە. هەروەک ژێر دەستان کاتێک خراپە لەبەر زەبروزەنگ تەرک بکەن و زۆرداریش ئەوان نەترسێنن دیسانیش بێ هانا و چەوساوە دوور لە چاوی خەڵک ئۆخژنیان نایەتێ و پەنا و هیوا وفریادرەسیان بەرجی خودا پێ شک نایە و هیوا وتەماح ودنەی خەڵک دەست دەکەن بەخزمەت بە هەتیو و بیوەژن و نەخۆشی غەریب ونامۆ ( نەک خەڵکی ناو بەدەرەوە وناسراو ) ودەستگرتنی لێقەوماوو بێ دەرەتان وکوفاری زیمی و ئەوانەی پێویستییان بە یارمەتی هەیە .

جا دڵبەندی وهۆگری یاهومێد وترس بەرهەم نادەن مەگەر هیوای لوتف و رەحمەتی خوای لەگەڵ بێ وترسی عەزاب و ئازاری سەختی ئەو. ئەم هومێدو ترسەش لە دڵی ئینساندا جێ ناگرێ مەگەر بە پێ سپێراوی و رەساڵەتی پێغەمبەران نەبێ کە لە لایەن خوای پاک و تاکەوە دەنێرێن .

**هۆی شەڕەف**

ئینسان نە تەنیا بێ گیانێکی بێ هەست وشعوور وحەیوانێکی تەوەزەل نیە کە تەنیا بەپێی هەستی غەریزە بژی بەڵکوو خولقاوێکە لە هەموان گەورەتر و دەتوانین بڵێین دنیا تەنیا لەبەرخاتری ئەو ساز کراوە و بۆ قازانج وبەرهەمی ئەوە. هۆی ئەم سەرەتییە عەقڵ وهۆشە، کە بنەمای هەموو چاکەیەکی ئینسانییە. ویژدانە کە رەحم وبەزەیی ودڵاوایی لە سەر ئەو دامەزراوە، عیلم و زانستە کە بەرەوفەزای کاکێشانی نادیاری دەفڕێنی و بەم هێزەوە لە گەنج وکانگای ژێر زەوی و گیاوگوڵی سەر زەوی کەلک وەردەگرێ.

ئەم هۆیانە دەبنە بنۆسی ژیان ودور بوونەوە لە ژینی حەیوانی ئینسان. جا بەرهەمی ئەدەبی وئەبەدی و حەسانەوە و ئێرووی لەبڕان نەهاتوو لەم دونیایەدا بۆ ئینسان پێک نایە مەگەر ئینسان نەجیب وخزمەتکار وفەرمانبەر بێ وقازانجی بۆ هەموو ئەندامانی کۆمەڵ بێ .

یا ئەگەر سزا وجەزایەک لەبەرامبەر ئازاردانی خەڵکدا بۆ ئەو نەبێ و بە تاشای دڵی بکوژێ وببڕێ وخوێن برێژێ و ماڵ وناموسی خەڵک تاڵان بکاوببێتە ملەو زەرووی کۆمەڵ ، ئەوە شتێکەعەقڵ بەهیچ جۆر نایسەلمێنێ .

پەس ئینسان پێویستی بە رەسالەتی بێ بڕانەوە وئەبەدی هەیە کەرەسالەتی ئیسلامە وچاکەوخراپە بۆ ئاقڵان ئاشکرا دەکا وجەزای خێروسزای شەڕیان بۆدیاری دەکا و ئەوە روون دەکاتەوە کەتۆسکاڵێک لەم دنیا پان وبەرینە لەخوا شێراوە نیە وئینسان پاش رابواردنی تەمەنی دونیا بە ئاخیرەتەوە دەلکێ و جەزای چاکەی خۆی وەردەگرێ. دەبێ لە کاری خۆماندا بینا و لە خووخدەدا هێژابین و کردەوەمان رێک وپێک وبەنەزم بێ .

**أَفَمَنْ يَمْشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِ أَهْدَىٰ أَمَّنْ يَمْشِي سَوِيًّا "عَلَىٰ صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ.**

ئەرێ ئەگەر کەسێک بەراودم بەعەرزدا بخشێ یا خۆ بخوشێنێ هیدایەت بووە یا ئەوە کە رێگەی راستی هەڵبژاردووەوقیت وقایم پێیدا دەڕوا ؟

"درێژەی هەیە"

# شێعر و ئەدەبی کوردی...

خوالێخۆشبوو: محەمەد سلطانی زادە

شیعرگوتن لە کۆنەوە لەنێو کوردانا باو بووە. هێندێک زانا "گاتا"کان کە سروودی ئایینی زەردەشتن و لەنێو گەلە ئێرانی یەکانا بەرە بە بەرە لەبەر کراون و گوتراونەوە، بەکوردی دەزانن. چونکە واژەی "گاتا" لەگەڵ "گاز، گاس"ی کوردی یەکن. "گاز" یا "گاس" کردن بە کوردی مانای بانگ کردن دەدا. ئەم واژەیە هەرئێستاش لەنێوان زوربەی کوردەکانا بەو مانایە دەکار دەکرێ. با ئەوەش بزانین کە نزیکەی تەواوی ریشە وبنە*ی واژە کوردی یەکان لەگەڵ واژەکانی کتێبی ئەوێستا یەکتر دەگرنەوە.

پاش گاتاکان دەگەینە "بەیت" کە زۆر کۆن و لەمێژین و ریشەدارە. بەیت کەلەپوورێکی* کۆنە کە بەسەرهاتی ئەویندارانە و پاڵەوانانە و باسی راوو نێچیر و ئەخلاقی مرۆڤ و رووداوی ئایینی دەخۆدا تۆمارکردووە و سەر گوزەشتی مێژوویی وەک شەڕی پیاوانە لەگەڵ دوژمن و نەتەوە*یمان بۆدەگێڕێتەوە. لە زەمانی کۆندا کە سنعەتی چاپ و نووسین وەک ئەوڕۆ پەرەی نەگرتبوو رووداوەکانی ژیانی کوردەواری دەکرانە بەیت و بە گوتنی زۆر و دووپات بوونەوە جەماوەرێکی زۆر فێری دەبوون و دەپارێزران.

بەیت لەراستیدا هونەری کۆمەڵگای ئاژەڵداری کوردستانە و رەنگە لەنێو هیچ نەتەوەیەکی دیکەی جیهاندا وێنەی نەبێ. ئەو بەیتانە لەکۆڕو مەجلیسانا بە دەنگی خۆش وخرۆشی بەیت بێژان دەگوتران و زۆریان لایەنگری لێ دەکرا.

پاش بەیت دەگەینە شیعری بڕگەیی کە بناغەی شیعری کوردین. پێشەنگی ئەو شێوە شیعرە عەلی بەردەشانی و عەلی حەریری بوون وەک حاجی قادر دەڵێ :

**دوو عەلی هەن....وەکوو حەسان**
**بەردەشان وحەریرە مەسکەنیان**

شاعیرانی ئەو شێوازە دڵۆڤان وو جوانی پەرست و خولقێنەرن و کاریان بۆتە هۆی دەوڵەمەندی و رازاوەیی وێژە و ئەدەبی کورد.

وێژەرانی شیعری ئەو سەردەمە، لە بوغز و رق و کینە بەتاڵ بوون. شیعرەکانیان رەوان و سادە ودڵ بزوێنە جوانی سروشت نێوئاخنی شیعریان. بە هۆی دووری لە دەربار و دام ودەزگای خوونکار و ملهوڕان کەلامیان رەوان و سادە و خاوە وشیعر نەبۆتە گشتەک و گرێ پووچکە. بۆ نموونە چاو لەوشیعرانەی خوارەوە دەکەین.

عەلی بەردەشانی دەڵێ :

**شەڕی بەران و کاوڕان**
**بکێش تەنگەی سمخڕان**
**لەوان دۆڵ و شیووخڕان**
**بۆ کێهانە دێنن قڕان ؟**

* *

دڵم راناوەستێ لەبەر ئەوێ غەمێ، لەبەر ئەوێ ژانێ، بانگێکم وەبەر خوای ئەوی دیم وەبەر پێغەمبەری لەبن گوێم دێ هاڕەی قاڵینی دەگەڵ چریکەی کۆتانێ

( سەرەتای بەیتی دمدم)

لەو دوایانەدا هێندێک لەشاعیرانی کورد ئاوڕیان داوەتەوە سەر ئەم شێوازە لەوانە یەکیان هێمنە وئەوی دیکە گۆران

گۆران دەکارهێنانی سنعەتی جوان بێژێ (بدیع) و عەرووزی بەجارێک وەلا ناو شێوازێکی تازەی کردە باو.

بەشێکی تر لە قسەی هۆنراوەو رێک و پێک لە زمانی کوردیدا بەستە و گۆرانی یە. کە لە کۆنەوە داوەتی پێ گەراوە، یا سەربەخۆ گوتراوە ومەجلیس و کۆریان پێ گەرم داهێناوە. گۆرانی و ئاواز لەنێو هەموو چین وتوێژێکدا بە دەنگی خۆش گوتراوە. بۆ نموونە لەکۆتایی دەورەی فەقێ یەتیدا یا جێ نشینی کورە شێخ لە جێگەی باوکی لەنێو مەشایخاندا گۆرانی و ئاواز دەگوترێ و گەری هەڵپەرکێ دەگەرێ. هێندێ کەس هەن کە کار و پیشەیان گۆرانی گوتنە وشایی و زەماوەند دەگێرن و پێیان دەڵێن "شایەر".

بەوانەی کە دەنگ خۆشن و گۆرانی و حەیران و لاوکان دەبێژن گۆرانی بێژ و حەیران بێژ دەڵێن. گۆرانی و ئاواز و هەوای کوردی گەلێک زۆر و جۆراو جۆرن کە ئەوانی هەرە گرینگ بریتین لە:

١- حەیران، یا لاوک ٢- قەتار ٣- بەیت ۴- تەرانە یا بەستە (ئستران)

١- حەیران: ئاوازێکی دوور ودرێژە کە لە دەورانی ئاژەڵداری یەوە ماوەتەوە و لە ناوچەیەکەوە بۆناوچەیەکیتر رۆیشتووە و زۆر جۆری جیاوازی هەیە ناوەرۆکی حەیران زۆرتر بابەتی ئەویندارى راو و شکار، شەر وغەزا و شکان و ژێرکەوتن و بەسەرهاتی دلتەزێنی نەتەوایەتی و کۆمەلایەتین. حەیران ئاوازی ناوچە دەشتاییەکانی کوردستانە و زۆرتر لە ناوچەکانی هەولێر وجزیرو بۆتان و دیاربەکر دا باوە.

ئەگەر جازی رەسەن هاواری رەشەکانی ئەمریکایی دابنێین دەبێ حەیرانیش بە هاوار و ناڵینی نەتەوەی کورد بزانین لە حەیراندا زۆرتر دەردوداغ دەردەبرێن

٢- قەتار: ئاوازێکی بڵیندە، وە ئاوازەکانی فارسی دەچێ. ئەغڵەب شیعری جوانی شاعیرەکان دەبێتە پێخۆری ئەم چەشنە ئاوازە وەک شیعرەکانی مەولەوی ئەورامی (تاوە گۆزی).

ئەم ئاوازانە مەقامیشیان پێدەڵێن..

٣- بەیت: داستان و سەرگوزەشتی کەلەپوورین کە بە دەنگ دەگوترێن و پێشەکی باسێکمان لێکرد.

۴- تەرانە: کە زۆرتر بەستە و ستران یان پێدەڵێن زۆر و زەوەند و جۆراوجۆرن. تەرانەی هەمەرەنگەی جیاواز لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا لەلایەن دەنگخۆشانەوە دەگوترێن.

ناوئاخنی تەرانە یان بەستە زۆرتر پێهەڵا گوتن بە ئەوین وجوانی ولەبارییە ئاهەنگ و هەوای بەستە توند و گشتە و زوربەیان داوەتیان پێ دەگەرێ.

**شیعری کلاسیک:**

لە رەوەندی پێگەیشتن وپەرەسەندنی ژیانی مێژوویی کوردستاندا وردە، وردە لێرولەوێ ناوەندی خوونکار و ئەمیرە کوردەکان وەک دەرباری ئەمیرانی بابان لە ناوچەی شارەزوور و سلێمانی دا یا ئەمیرنشینە کوردەکان لە کوردستانی ژورووددا.

شاعیرانی کورد بە لاسا کردنەوەی شاعیرانی فارس و عەرەب کەوتنە نێو داوی ئالۆزی عەرووز و قافیەوە. لەو ماوەدا شاعیری گەورەی وەک ئەحمەدی

خانی، مەلای جزیری، مەولەوی تاوەگۆزی حاجی قادر، مەحوی، خانای قوبادی، وەفائی، سەیفی قازی، و پیرەمێردوهەژار و هێمن و قانیع سەریان هەڵدا.

سەیف وهەژار و هێمن و قانیع و پیرەمێرد ئاڵ وگۆرێکی هەراویان لە شیعری کوردیدا پێک هێناوە. سەیف بۆ یەکەمجار شیعری کوردی بژار کرد ولە واژەی عەرەبی و فارسی وترکی هەڵیێژارد. چوار کەسەکەی دیکەش لە شێوە وسەبک و نێوەرۆکدا نوێ یان کردەوە. ئەم شاعیرانە کەم کەم خۆیان لە سەبکی کلاسیک دزیەوە وبەرەو رئالیسم تێکشان وباسی سیاسەت و رووداوی کۆمەڵایەتی یان بە هەراوی هێنا مەڵبەندی شیعر.

بەڵام گۆران لەسەرەتاوە قالبی کۆنەی شیعری لەبەر شیعری کوردی دارنی و شێوازی نوێی دامەزراند. ژمارێکی زۆر لە شاعیرانی لاوی سەردەمی ئێمە بەو رێبازە نوێ یەدا دەرۆن وەک شێرکۆ بێکەس و سوارەی ئێلخانی.

شاعیرانی کورد بەهەر شێوەوشێوازێک شیعریان گوتبێ شان لە شانی شاعیرە هەرە بەرزەکانی رۆژهەڵات دەدەن. بۆ نموونە بەکورتی یادێکی چوار شاعیری پایە بەرز دەکەین.

١- ئەحمەدی خانی: رۆژهەڵاتناسێکی شوورەوی دەڵێ لە رۆژهەڵات دا سێ ئەسەری نەمر هەیە کە بریتین لە دیوانی «وستا ولی» شاعیری گورجی.شانامەی فیردەوسی ومەموزینی ئەحمەدی خانی.

خانی لە ساڵی ١١٠٠ دا ژیاوە ولە نووسینی چیرۆکی عاریفانەدا کەسی ناگاتێ.

٢- نالی: "ئۆژین ئۆبین" سەفیر و نووسەری گەریدەی فەرەنسی لە ساڵی ١٩٠٦ و١٩٠٧ دا دەنووسێ " لەنێوەراستی قەرنی رابردوودا شاعیرێکی گەورە لە کوردان هەستا کە ناوونا وبانگی لە چوارچێوەی عێل و عەشیرە سەری کرد و لە رۆژهەڵاتی نێوەراستدا مەشهوور بوو شیعری ئەم شاعیرە پایەبەرزە ئەمرۆ ویردی زمانی شیعر ناسان و شاعیرانی کوردستانە. ئەو شاعیرە مەزنە لەساڵی ١٢١٥ای کۆچی لەدایک بووە وبۆ غەزەل و رەوان بێژی دەچێتە رێزی شاعیرانی گەورەی جیهان.

٣- مەولەوی تاوەگوزی :

عاریفی سەوداسەر وشەیدای ئەوین بوو. بێگومان یەکێکە لە شاعیرانی گەورەی رۆژهەڵات. ئینسانذۆستی وعیرفان و جوانی پەرستی لە شیعری ئەودا لێک دەدرێن و جۆش دەخۆن و بابەتی جۆرا و جۆر بە زولاڵی کانیاوەکانی کوردستان پێک دێنن. مەولەوی لە ١٨٠٦ دا لە دایک بوو و لە ساڵی ١٨٨٢ دا وەفاتی کرد.

٤- گۆران :

ساڵی ١٩٠٤ یا ١٩٠٥ ماتۆتە سەر دنیا ولە ساڵی ١٩٦٢ دا وەفاتی کرد. گۆران هەروەک گوتمان قالبی عەرووز و قافیەی تێک شکاند و رچەی بۆ شیعری نوێ کردەوە. گۆران بۆ داهێنانی ئەم شێوازە تازەیە روو دەکاتەوە سەر شیعری هیجایی کۆن کە لەنێوان شایەر وبەیت بێژەکاندا باو بووە. لەباری ناوەرۆکەوە گۆران بابەتی تازە و جوان دەکاتە نێوئاخنی شیعرەکانی شیعری نوێ لەنێو کورداندا وەک شیعری نوێ لەنێو فارس و عەرەباندا غەریب وسەیر و سەمەرە نیە. چونکە رابردووی شیعری هیجایی لەنێو کورداندا زۆرکۆنە. گۆران شێوازی رئالیسمی لە شیعری کوردیدا رەچاو کردووە و بەم کارە خۆی

دەگەیەنێتە ڕێزی شاعیرە بەرزەکانی جیهان .

ئێستا نموونەیەک لە شیعری ئەم شاعیرە پایەبەرزانە دەخەینە بەرچاو :

١- خانی (باسی گەورەیی خودا دەکا)

تۆی چویەتە ڕەنگی بەرگی سوورگوڵ
تۆ بوویەتە سۆزی جەرگی بولبول
تۆ تیشکی لە کوڵمی دلبەراندا
تینی لە دەروونی دڵتەراندا
رۆژیت و کەچی ونی لەبەر چاو
رووناکی نە چەشنی ئاگر و ئاو
هەرچی هەیە لێی جیا و جیانی
بێ جیی و چ جێش نیە تیانی
گیان تیشکی پریشکی تۆیە روونە
گوڵ تیشکی کەلێ نەدا زەبوونە
(وەرگێرانی ـ هەژار)

٢- نالی دەڵێ :

تۆ کە حۆری وەرەناو جەننەتی دیدەم چ دەکەی
لە دڵی پڕ شەڕەرو سینەیی سووزانمدا

* * *

گەرمی و تەڕی بەهارە کەپشکۆ کوژایەوە
پشکۆی گوڵ ئاتەشین بە نەسیم بو گەشایەوە

دەخیلت بم، نە خیلی یا روتابی
وەها شیرین و سینە نەرم و دڵ ڕەق !

٣- مەولەوی تاوەگۆزی دەڵێ :

روخسارەش وەختێ مەشقەڵ مەدۆڵێش
وەشنەی پارێز خەیاڵ مەبۆ رێش
پۆس کۆس گۆش نەمکێشا کەم کەم
ئەم سەرەو سەرەن دووربینەکەی چەم
باڵەخانەی چەم دیوانەکەی تۆن
بانە ناو وەگڵ ئاسانەکەی تۆن
تیکەش عاجز کەرد خەیاڵت تیشدا
ئازیز بۆ جارێ پا بنیەر پێشدا
هەر ماهی نەو بۆ حالم پەشێوەن
هیلالش شێوەی ئەبرۆی تۆی پێوەن

٤- گۆران :

هێرۆم بۆیە لاپەسندە
لەسەر رەگێکی قووڵ بەندە
بەسەر درکی ژینا زاڵە
هەمیشە سەرلقی ئاڵە

* * *

هەنگە زەردە ئەبڕێ ڕێی دوور
بۆ بینینی گوڵاڵەی سوور
لەناو دێوە پۆل پۆل نازدار
ئەشێلن سەوزە گیای بەهار
بۆ لای شوانی شمشاڵ پڕجۆش
هەی بەختی باش! ژیانی خۆش!

* * *

وەک سوێسکە بڕۆ، ئاسکەنیگای چاوی رەش ومەست
پڕعیشوە بچەرخێنە، ئیتر هیچ مەبە دەربەست
چەن مالّ ئەڕمێ! چەن شل ئەبێ هێزی لەش ودەست
ئێوارەیە وا هەڵگرە ساگۆزەیی تازە!

# عیلاجی حەوتوویی..!

گۆواری ژمارە هەشتی سروە وتارێکی بلاّو کردەوە، بەناوی "حەوتوویی" کە لەودا هاوکارێکی سروە لە "٧" ترسابوو .لەئاخری ئەم وتارەدا نووسرابوو:

ئەی خودای حەوت تەبەقەی عەرز وئاسمانان بۆخاتری گەورەیی خۆت ماشێنێکی چاپ بە نسیب "سروە" بکەی کە خۆی "٧" لەسەر پیتەکان دابنێ و ئەم "حەوت"ە مەزلوومەی سروە لەچەنگ ئەم هەموو گلەیی وبناشتەی خوێنەرانی بەرێز رزگار بکەی........

هەوالّنێری سروە لە شاری لەندەنەوە مزگێنی ئەم کارەی داوە و لە وتارێکی جوان ورازاوەدا، بوونی وەها ماشێنێکی راگەیاندووە .

ئەم برادەرە دەنووسێ:

هاوینی پار چەند کوردی پەڕیوەی لەندەن گەلاّلەیەکی کامپیوتێری شەش زمانە

(کوردی، فارسی، عەرەبی ئینگلیزی، فەڕانسەیی ئیسپانیایی)یان داڕشت و دایان بە کامپیوتێر.

ئەم بەرنامە لەسەر کامپیوتێری کۆمودوری ١٢٨، کار دەکا.

هەموو پیتەکانی کوردی پێ دەنووسرێ تەنانەت دەتوانی لەهەمان کاتدا بەکوردی و ئینگلیزی یا پیتی گەورە و بچووک بنووسێ. من ئەم کامپیوتێرەم کڕیوە......

هەروەها لە درێژەی باسەکەیدا دەنووسێ:

من نازانم ئێوە لە سروە تا چ رادەیەک

لەگەڵ کامپیوتێر شارەزان
لەکارهێنانی زۆر سانی یە.
دانانی ئەم بەرنامە
کوردی یە دەسکەوتێکی زۆر
بەنرخە بە شێوەیەکی

گشتی بۆ کورد وبەتایبە-
تیش بۆکاری رۆژنامەگەری و

نووسەران .

نرخی کامپیوتێرەکە (کە
لە چوار پارچە پێک
هاتووە) بە بەرنامە
کوردی یەکەیەوە دەکاتە
دوو هەزار دۆلار. بەرنامە
کوردی یەکە نرخی دوو سەت
دۆلارە. کتێبی رێنوێنی
کارکردن بەکامپیوتێرەکەش
لەگەڵ مەکینەکە دەنێرن کە
بە چەند زمانی جۆراوجۆر
نووسراوە .

جێی رێزە کە چەند
برای کورد توانیویانەوەها
بەرنامەیەک دابرێژن و
کارێکی وا بەجێ بکەن کە
بەبڕوای ئێمە ئەگەر وەها
شتێکمان وەدەست بکەوێ
هەم هاوکارەکان لەنەخۆشی
وەگری حەوتوویی دەپارێزرێن
و هەمخوێنەران دەحەسێنەر،
و لە ئاکامدا خزمەتێکی
گەورەیە بە فەرهەنگ و
ئەدەبی کوردی .

«زانایانی بەناوبانگی کورد»

# شێخ رەئووفی زیایی

عومەر- فارووقی

ماموستا شێخ رەئوفی زیایی کوڕی خوالێخۆشبوو حاجی شێخ مستەفاجوانڕۆیی بووکە باوکی ئەو واتە حاجی شێخ مستەفا ،خەلیفەی سیراجەدینی گەورە بووە و لەگەڵ شێخی بورهان و مەولەوی تاوەگۆزی و حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە دۆست و هاوخەلیفە بووە و ناوی لەکتێبی یادی مەردان نووسراوەی ماموستا مەلا کەریمی مودەڕیس نووسراوە. حاجی شێخ مستەفا لەلایەن شێخ سیراجەدینەوە بۆ رێنوێنی موسوڵمانان ناردراوەتە سەقز.

شێخ رەئوفی زیایی لە ساڵی ١٢٧٣ی هەتاویدا لە شاری سەقز هاتۆتە دونیا دایکی عادلە خاتوون کچی شێخ عومەری بیارە ،زیائەدین بوو کە مەولەوی نەمر چەند پارچە شێعری سەبارەت بەو پیاوە مەزنە گوتووە. ناوبانگی شێخ رەئوفیش بە زیائی هەر لە عیشقی شێخ عومەر بووە .

خوالێخۆشبوو زیائی لە خزمەت شێخ عومەر و عەبدولقادری موودەڕیس خوێندنی دەست پێکردووە و لەلای ماموستایانی زانا و گەورەی وەکوو مەلاعەبدولعە - زیمی موجتەهید و شێخ لەتیف قەرەداغی و مەلا ساڵح ئیمامزادە و چەند ماموستای گەورەی دیکەدا خوێندنی تەواو کردووە و ئیجازەی وەرگرتووە وبۆتە حاکمی شەرع وقازی سەقز.

لەساڵی ١٣٠٥ی هەتاوی چووە ریزی کاربەدەستانی دەوڵەتی وبوو بەهەڵسووڕێنەر و بەرپرسی فەرهەنگ و ئەوقافی سەقز. پاشان لە شارەکانی بانە، سەردەشت سەحنە ،باختەران، هەمەدان خوانسار ،خومەین وتاران لە دووخانیات و داراییدا خزمەتی خۆی بردە سەر و گەڕاوە سەقز، کرا بە ئیمامجومعەی شاروبەرپرسی شووڕای داوەری. بەڵام پاش چەند مانگ بۆ هەمیشە وازی هێنا ولە ماڵی خۆی دانیشت وگۆشەگیر بوو.

شێخ رەئۆف لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا چووە ناو ریزی موسڵمانەکان و دژی رووسیەی تەزاری غەزای کرد و لەسیاسەت وئاڵ و گۆڕی کوردستان بەتایبەتی مەڵبەندی سەقزدا دەورێکی گرینگی بووە. لە لایەن وسووقدە و لە. سەرەک وەزیری ئەوکاتی ئێرانەوە حوکم درا بەحاکمی کوردستان (شریف الدولە) کە هاورێ لەگەڵ سەرەک عەشایری گەڵباغی وتیلەکۆ و بانە ئەویش ئیعدام بکرێ.

ئەڵبەت شەریفدەولە توانی بەهاوکاری هێزە داگیرکەرەکانی ئینگلیسی گەڵباغی یەکان بکوژێ و لە سەقزیش حەبیبوڵلاخانی تیلەکۆ ورۆستەم خانی بانەیی لە قەنارە بدا، بەڵام زیائی هەڵات وبە لەونێ خۆی شاردەوە کە بۆیان نەدۆزراوە .

شێخ رەئۆف لە شیعری فارسیدا یەکێک لەشاگردەکانی حافزی شیرازە وبە شێوەی ئەو غەزەلی داناوە، لە (ئەلف) تا (ی) غەزەل و قەسیدەی نووسیوە و لە شیعری کوردیشدا بەشێوەی نالی وشاعیرانی گەورەی کورد شیعری داناوە.

مامۆستا زیائی لایەنگری شیعر و وێژەی کۆن بوو و لە سەرشێوازی شیعر و وتار زۆر دەڕۆیی. تەنانەت کتێبێکیشی بەناوی عەرووزو بەدیع وقافیە نووسیوە.

شوێنەوارەکانی ئەوانەن:

١- **دیوانی شیعریکوردی.**
٢- **دیوانی شیعری فارسی.**
٣- **چوارینەکانی فارسی.**
٤- **آراءالفریقین .**
٥- **عروض و بدیع و قافیە .**
٦- **ژیاننامەی خۆی.**

مامۆستا زیائی لەو ئاخرانەدا پیر وپەک کەوتە ببوو. زۆری حەز دەکرد کە شوێنەوارەکانی چاپ بکرێن.

بەڕاستی خۆمبەخەجاڵەت وشەرمەزاری ئەوخوالێخۆشبووە دەزانم کە نەمتوانی بەر لەمردنی ئاواتی چاپی شوێنەوارەکانی وەدی بێنم. بەڵام خوا یاربێ بەمزووانە کتێبخانەی کوردستان بە شوێنەوارەکانی ئەودەولەمەند دەکەم.

مەرقەدی شێخ رەئۆف زیائی لە خانەقای شێخ مستەفای سەقز دایەوتەرمی پیرۆزی لەحوجرەی تەنیشت حوجرەی باوک وبراودایکی نێژراوە وخەڵکی سەقز لە فاتیحەخوانی ئەو شاعیر و لێزانە بەشداریان کرد و رێزیان لێگرت .

خوای لێ خۆش بێ.

**کتێبی تازە دەرچوو**

ناوی کتێبەکە: **دربارە داستان عارفانە شیخ صنعان**

نووسەر: **تاها فەیزی زادە .**

بەفرانباری ساڵی ١٣٦٥ چاپ کراوە.

لەم کتێبەدا باسی بایەخی **ئەدەبی رۆژهەڵات** کراوە کەچۆن شوێنی لەسەر ئەدەبی دونیا داناوە .

دوایە سێ زمانی **کوردی** و **فارسی** و **تورکی** لە پەنا یەک داناوە و پێکەوە هەڵی سەنگاندوون .

ئەسڵی بەیتەکە بە لەهجەی **شیمال** و **نێوەراست** و **جەنووب**نووسراوەتەوە

ئەم کتێبە لە لایەن چاپخانەی ئازەرابادەگانەوە بە **قەتعی وەزیری** چاپ کراوە.

ئەڤرۆ هـات و بـهـاره
دەربوون چۆم وجەلالـە
هاتـن تـەیر و ئیخالـە
*　　*　　*
هاتـن تـەیر و کەودەری
مەجل دگـۆتـە عـەلـی
مەجل دگـۆتـە حـاجـی
*　　*　　*
ئەڤ کەوگیرێ سو تی یە
عەمێ لـەبـۆ هـاتی یە
*　　*　　*
عەمێ لـەخـو تـەڤێتـە
حەتا پێ سۆ ر نـەهێتـە
پێ سۆ ر ل دەشتێ تێتە
*　　*　　*
شـەڤـێ رۆژێ خـەبـاتـە
خلاس کـرن وەلاتـــە
*　　*　　*
خـلاس کـرن چیـانـە
دەرێێ سیتێ ڤـەمـانـە
دەرێێ سیتێ یێ تێنـە
بە فەرو چەنگ وپێنە
بۆ مەوتنێ خۆ تێنـە
*　　*　　*
بۆ مەوتنێ زۆزانـێ
سەرا گەهشتە „گیمانـێ"
بەراهی بۆ ری • ڤەسرانی"
*　　*　　*
بەراهیا وانا بخۆشی یە
یاب غولغول و ڤیژی یە
*　　*　　*
خوشیێ سـەرێ نیسانـێ
بەلەک کەتنە زۆزانـێ
گەوگیرچوونە باسکێ باسترانێ"
*　　*　　*
مەکەو ئینان دەینان ن

ویرای سپاس لە خ ـ سالح

چنی ل بەر رەشانـد ن
*　　*　　*
چنی یۆ لەو چنی یـۆ
مە کەو ئینا ن داگرتـن
عەیشا بۆ ئەو نڤستـن
*　　*　　*
نڤستن بە دلەک شەڤـێ
دژوار بوو عشقا کـەوێ
ئەز راکرم نیڤ شەڤـێ
*　　*　　*
ئەز راکرم سەرمەستـە
چارپێ ودوو بەربەستـە
ژنوێ من قەوەت خوەستـە
ئەچوومەژدەرڤە چ وەختـە
عەسمانا دباریت نەختـە
*　　*　　*
عەسمانا بی یە عەڤراڤـە
هێدی یا دباریت خوناڤـە

*　　*　　*
چ خوناڤـەکا هـویـرە
ل عەردێ یا بی یی مەخمیرە
*　　*　　*
شێعرێ ناکەم درێــژە
رابووم من کر نڤێــژە
*　　*　　*
رابووم فەنەر بەردایێ
ئوریم تکە ل یابایێ
ئوریمتکەل هزرو تەخریمـا
ب قوەتا شاهێ میـرا
دەرکەت جـۆتی کەوگیـرا
*　　*　　*
دەرکەتـن جـۆت بەجـۆتـە
جەلابێ بانگ دەگـۆتـە
عشقا دلـێ من سـۆتـە
*　　*　　*
عشقا دلـێ مـن کـەلـی
بوو غولغولا عەندەلـی
*　　*　　*
بوو غولغولا بێچـی یـا
شەڕ کەتەهەردووتی‌یا (چی‌یا)
لێ بوو سبکێد جخسی یـا
*　　*　　*
لێ بوو سبکێد حـەدادا
حەرب و زەربا پێک دادا
شاپەڕ چوو سەر ربـادا
*　　*　　*
رباد قـەوی دغـەدار ن
خۆش میر لەوا ن بژارن
(قوپ کولالۆ جامێدەر)
*　　*　　*
چەرخەچی بۆ دوو بەردان
شەرێ پۆشی بـەزانـد ن
تەفشێد شیرا فـڕانـد ن
سەرک و دەڤە ئینانـد ن
*　　*　　*

شەرێ پۆشی بەلاڤە
پۆشی رەش هاتە ناڤە
بێچی یا هەوەک بخوداڤە
* * *
بوو غولغولا عەندەلی
* * *
بوو غولغولا بێچی یا
شەڕ کەتە هەردوو تی یا
لێ بوو سبکێد جخسی یا
* * *
لێ بوو سبکێد حەدادا
حەرب وزەربا پێک دادا
وان سینگ وسینگ خولێکدا
* * *
بۆ تماشێ وەزیرا
...........
بۆ تماشێ وەزیرا
بو تماشێ ئاغایا
ئەز بەزیمە ئێخسیرا
* * *
ئەز بەزیمە وێ گاڤێ
من ڤەکرن ژ داڤێ
* * *
هەچیێ خوناف ل پشتێ
ژێ تێت بێنا بەحەشتێ
* * *
ئەڤرۆ هات و بهارە
ئەڤرو هات و بهارە
* * *
دەربوون چوم وجەلالە
خڕبوون تەیرو تەوالە
هاتن کەوو ئێخالە
* * *
هاتن کەوو کەودەری
مەجید دگۆتە عەلی
* * *
من ژ خودێ خۆ دڤێتە
حەتا پێ سۆر نەهێتە
پی سۆر ل دەشتێ تێتە
* * *
شەڤ و رۆژێ خەباتە
خلاس کرن وەلاتە
دەریێ سیتێ دەهاتە
ژ بۆ مەوتنێ خۆ هاتە
* * *
ب دەریێ سیتێدا تێ وَ
ب چەنگ وشەڕ و پێ وَ
ژ بۆ مەوتنێ خۆ تێ وَ
* * *
ئەو مەوتنێ زۆزانا
بەراهی چوو کویستانا
* * *
دوماهی ما ل ـ قەسرانێ.
نڤستن بە دلەک شەڤێ
دل شیاربۆ عەشقا کەوێ
* * *
ئەز هشیار بوومچ وەختە
ژ عەسمانا دباری نەختە
من ژنوێکا قەوەت خاستە
* * *
قەوەتا شاهێ میرا
دەرکەتە جووتەک کەوگیرا
* * *
دەرکەتن جۆت بەجۆتە
جەلابێ بانگەک گۆتە
عەشقا دلێ من سۆتە
* * *
عەشقا دلێ من کەلی
بوو غولغولا عەندەلی
* * *
بوو غولغولا بێچی یا
ئەز چووبوومە کێری یا
مەسەبەکا قەدایی
ناڤ کولیلکا و گیایی
* * *
چ بهارەکا رەنگینە
ژ کولیلکا سۆروشینە
جەلابێ بانگ هەلینە
* * *
کەوەک تێت ل جزیر
کەوەک هات ول جزیر
قەبە قەبە وسیرە سیر
شەڕ کەتە مەسەبامیر
* * *
کربوو سبکێد حەدادا
بحەرب وزەربا پێک دادا
شاپەڕ چوو سەر ربادا
* * *
رباد قەوی دغەدارن
خۆش مێرێدوار دبژارن
* * *
(قوپ قولا لۆ جامێدەر)
چەرخەچی نە دوو بەردار
* * *
شەرێ پۆشی بەلاڤە
وان کوڤلێ سینگالێکدان
پۆشی رەش کەتە ناڤە
بێچیا هەوەلێ ل خوداڤە
* * *
(قوپ قولالۆ تەعلکە)
پێگڤە بوونە هەڤرکە
* * *
بۆ تماشێ وەزیرا
وەز بەزیمە ئێخسیرا
* * *
هەچیێ کەتە ل داڤێ
وەز بەزیمێ وێ گاڤێ
* * *
هەچیێ خوناف ل پشتێ
ژێ تێت بێنا بەهەشتێ
* * *

**عومەر فارووقی**

مەستوورەی ئەردەڵان

بێگومان خاتوونی شیعر و ئەدەبی کوردە وتائێستا هیچ ژنێکی دیکە لەمێژووی ئەدەبی ئێمەدا نەی توانیوە جێگەی ئەمشاعیرە تێکۆشەرەبگرێتەوە

ماه شەرەف خانم کچی ئەبولحەسەنخان بە نازناوی مەستوورە ،ساڵی ١٢٢٠ ی کۆچی بەرامبەری ١٨٠٤ میلادی لە شاری سنە لەدایک بوو ،باوکی یەکێک لە نزیکانی دەزگای حکوومەتی ئەردەڵان بوو. براکانیشی هەر یەکە زانا و بلیمەتی زەمانی خۆیان بوون. خوالێخۆشبوو میرزاعەبدوڵڵای سنەیی کە نازناوی "رەونەق" ودانەری تەزکەرەی(حدیقەامان اللهی) بوو ،برای مەستوورەیە رەونەق وەک بۆخۆی دەڵێ وەختێک دەبینێ ئەدەبیاتی فارسی خاوەنی مێژوویەکی ئەدەبی رێک وپێکە زگی بە گەلی خۆی دەسووتێ و دەست دەکا بە کۆکردنەوە و رێک و پێک کردنی مێژووی ئەدەبی کورد .بەرهەمی ئەم لێبڕان و تێکۆشانە کتێبی بەنرخی "حدیقەامان اللهی"یە کە بە ناوی "امان اللەخانی ئەردەڵان" کراوە وئەمرۆ یەکێکە لە سەرچاوە گرینگەکانی شیعر و ئەدەبی کوردستان. مەستوورە لە بنەماڵەیەکی ئاوادا گەورە بوو کەوەک گوتمان بنەماڵەیەکی پڕ لە پیاوی زانا و شاعیر و نووسەر بوو .لەو سەردەمەداژن لەهەموو چەشنە ئازادی یەک بێبەش بوون و تەنیا کار و باری ماڵیان بەستۆوە بوو لە خوێندن ومەکتەب وفێربوون دوور بوونەوە و دەرفەتی گەشەو هەڵدانیان پێ نەدەدان مەستوورە لەسایەی ژیانلەنێو کەس وکاری زانادا وەک سەر چاوەیەکی زوڵاڵ لەدەشتی قاقڕ و ئیشکارۆی نەخوێندەواری و نەزانین هەڵتۆقی و سەوزەڵانی وزەنوێری خستەوڵات بۆخۆی باسی خۆی دەکا ودەڵێ:

**من آن زنم که بملک عفاف صدر گزینم**
**زخیل پردگیان نیست درزمانە قرینم**
**بزیر مقنعه مارا سری است لایق افسر**
**ولی چەسود که دوران نموده خوارچنینم**
**مرا زملک سلیمان بسی است ننگ همیدون**
**کەهست کشور عفت بزیر نقش نگینم**
**بەمعشرنسوان در،سپاس و حمد خدا را**
**همی سزد کەبگویم منم کەفخر زمینم**
**علی عالی اعلی امیر صفدر حیدر**
**کەهست راهنمای یقین و رهبر دینم**

" من ئەو ژنەم کە لە هەرێمی پاکیدا لە لای سەروو دانیشتووم. لەنێو ژناندا لە زەمانەدا بێ هاوتام. لەژێر چارۆکە و چارشێودا سەرێکم هەیە کە شیاوی تاجە ، بەڵام ئەفسووس زەمانە قەدری نەزانیوم. من تاج وتەختی سولەیمانم بەلاوە بێ کەلکە چونکا هەرێمی پاکی و داوێن پاکی لەژێر نقیمی ئەنگوستیلەم دایە. لەدنیای ژناندا لە سایەی خوداوە دەتوانم داوا بکەم لەسەر زەویدا جێگەی شانازیم. عەلی ئەو ئینسانە بەرزە ،حەیدەری سەف شکێن ،رێنوێنی منە بۆ دین وگەیشتن بە یەقین" .

هەر وەک لە واتای ئەم شیعرانە دەردەکەوێ مەستوورە بەباشی خۆی ناسیوە و ئاگای

له گەورەیی وئەرکی سەرشانی
خۆی بووە وهەر بەم هۆیەشەوە
داب ودەستووری کۆمەلایەتی لە
مەرِ ژنانەوە ناوەتە ژێرپێ و
بەرەوگەورەیی و سەرکەوتن
بالی کێشاوە وبۆتە مەلەوانی
ئاسمانی شیعروئەدەب وگەیوەتە
رادەی مامۆستایی و لەگەلّ
شاعیرانی بەناوبانگی
سەردەمی خۆی وەک یەغمای
جەندەقی دەستی کردووە بە
موشاعەرە ودەمەتەقە .شاعیری
پایەبەرزی کورد نالیش لەو
سەردەمەدا لە سنە دەرسی
خوێندووە و شیعرێکی بەرزی
سەبارەت بە مەستوورە لە
دیوانەکەدا هەیە .

ماه شەرەف خانم لە
بنەمالەی قادری بوو . خوسرەو
خانی ئەردەلان حاکمی سنە کە
یەکێک لەگەورەپیاوانی کوردە
بانگەوازی جوانی و داوێن
پاکی وزانایی مەستوورەی
بیستبوو . هەر لەبەر ئەوەش
خوازبێنی لێکرد و ئەم دوو
ئینسانە باشە ژیانی
هاوبەشیان دەست پێکرد .خوسرەو
خان شاعیر وخۆش خەت و بە
هەست وزانا بوو کە بۆنیزیک
بوونەوە لە دەرباری شای
ئێران "حوسنی جیهان خانمی"
کچی فەتەلیشای قاجاریشی مارە
کردبوو . ئەوپیاوەبەناوبانگە
هەر لە تەمەنی لاوی دا بە
نەخۆشی تاعوون کۆچی دوایی
کرد و مەستوورەی بە داخ و
دەردەوە بەجێ هێشت .

پاش ئەوەی خوسرەوخانی
گورجی رەزاقولیخانی کوری
خوسرەوخان دەگرێ،مەستوورەی
دلّ شکاو لەگەلّ کورە پووری
رەزا قولی واتە حوسێن
قولیخانی ئەردەلان بەرەو میر
نشینی بابان رۆیشتووە و
سەرئەنجام لەتەمەنی ۴۴ سالیدا
یانی لەسالی ۱۲۶۴ کۆچی لە
شاری سولەیمانی دنیای بێ
وەفا بەجێ دێلێ .

مەستوورەی کوردستانی لە
مێژوونووسیندا زۆرسەرکەوتوو
بوو بەلام بە داخەوە
کتێبەکەی لە ژمارێکی زۆر،
کەمدا بلاو بۆتەوە وکەمکەس
ئەو خاتوونە بەمێژوو نووس
دەناسن .وەک ئەمن بیستوومە
مامۆستا قانیع ئەم تاریخەی
لە فارسی یەوە کردۆتەکوردی
کەمن نەمدیوە . بەلام ئێستا
دەرکەوتووە کە خوالیخۆشبوو
مەردۆخی کوردستانی لەنووسینی
تاریخەکەی خۆیدا زۆری کەلک
لەو بەرهەمەی مەستوورە
وەرگرتووە .

ناوی کتێبی مەستوورە
" مێژووی ئەردەلان"ە کە لە
۲۲۰ لاپەرِە لە سالی ۱۹۴۶،
زایینیدا بەهیمەتی خوالێخۆ-
شبوو ناسری ئازادپوور
لەچاپدراوە وئێستا هێندێ
نوسخەی لە چەند کتێبخانەدا
ماوە . بەراستی جێگای خۆیەتی
کە"مێژووی ئەردەلان" جارێکی
دیکەش بە رێک وپێکی لە چاپ
درێتەوە وچاوی ئەویندارانی
مێژووی کوردستان روون بکاتەوە
جگە لەم تاریخەنامیلکەیەکیشی
دەربارەی دین و شەرعیات
نووسیوە کەگوایەرەزا قولیخانی
هیدایەت نووسەری " مجمع
الفصحا " ناوی ئەم نامیلکەی
بردووە ومەستوورەی بەژنێکی
دیندار وپارێزکار ناساندووە

شیعرەکانی مەستوورە تا
ئێستا چەن جار وەک "دیوانی
شیعر' لە چاپدراون. وەک
دەلێن زیاتر لە دە هەزار
شیعری گوتووە . ئاخر جار لە
سالی ۱۳۶۲ی هەتاوی دا ،
دیوانەکەی دیسان بەتێکۆشانی
ئەحمەدی کەرەمی بەشێوەیەکی
جوان لەچاپ دراوەتەوە کە بە
داخەوە شیعرەکوردی یەکانی
تێدانیە . تەنیا لەم لاولا چەن
شیعر هەن کە دەلێن هی
مەستوورەن کە زۆرتر شێوەی
شیعری نالی وهاوچەرخەکانی
ئەوی هەیە وەک :

**گرفتارم بەنازی چاوەکانی**
**مەستی فەتتانت**
**بریندارم بەغەمزەی هەر دوو**
**چاوو تیری موژگانت**

وەکوو دەنووسن مەستوورە
زۆر شەیدای خوسرەوخانی
مێردی بووە وکاتی ئەم پایە
بەرزە لە سەردەمی لاویدا
دونیای بەجێ هێشت،مەستوورەی
دلسوتاویش دونیای توورِ،
هەلدا و بەرەو دەروونی خۆی
کە کەیلی یاد و بیرەوەری
خوسرەوخان بوو رۆیشت . ئەو
گەرانەوە بۆ دەروون بوو بە

هۆی ئەوە کە ئەمجار مەستوورە شیعری عاریفانە بڵێ و لە شیعرەکانی دا ئەوینی دنیایی جێگە بەئەوینی خودایی لێژ بکا . لەمەودوا زیاتری شیعرە کوردیەکانی مەستوورە بە شێوەی هەورامی گوتراون کەبە داخەوە هیچم لێ وەدەست نەکەوتوون ، لە ژێرەوە نموونەیەک لە شیعری فارسی ئەوتان پێشکەش دەکەم کە بێ گومان بۆ مەرگی خوسرەو خانی گوتووە .

**دور ازجمال دوست چنان‌گشته‌ام ملول**
**درمرگ خویشتن شده‌ام بی گمان عجول**
**من آنقدر بروی تو دیوانه نیستم جهول**
**گویی توخود پیامبر خوبان عالمی**
**کایات حسن کرده بەشانت همی نزول**
**عهدی کەدوش باصنم شهربسته‌ام**
**درعهد خویشتن نکنم تا ابد نکول**
**مستوره خون زدیده براو کی فشاندمی**
**بودی بەکوی آن مهما ررخصت باردگر کنند مرا عاقلان قبول**
**وصفت نمیتوان بەبیان آورم ، چرا**
**حسنت نه آنچنانکه تصور کنند عقول**
**حاشا کەمن زجور تو فریاد سر کنم**
**هرکس زدوست ناله کند دانمش دخول**

مەستوورە شارەزایی خۆی لەهەموو چەشنە بابەتێکی شیعری وەک قەسیدە و غەزەل و چوارینە ومەسنەوی‌دا نواندووە بۆ نموونە چاوێک بەوچوارینە پاراوانەی خوارەوەدا ، دەگێڕین .

**ازفرقت‌تو صبروتحمل تا چند**
**نالان و غزلسرا چوبلبل تاچند**
**خون شددلم ازمحنت‌ایام فراق**
**این جوروجفا بامنت‌ای گل تا چند**

**رفتی وبرفت‌جان شیرین زبرم**
**بازا کەزفرقت‌توخون شدجگرم**
**دروادی عشق توچنان گم شده‌ام**
**بالله کەدگر بکوی خودره‌نبرم**

مەستوورە خانم لەگەڵ ئەوەش‌را کە ژنێکی جوان و هەڵکەوتوو بووە ولەبنەماڵەی دەسەڵاتداران‌دا ژیاوەوخێزانی پیاوێکی وەک خوسرەوخانی ئەردەڵان بووە هەرگیز لە ڕێگای خوداناسی و دینداری لای نەداوە وخزمەت بەخەڵکی بە ئەرکی سەرشان زانیوە .بای دەمار زلی کەڵڵەی رەق نەکردووە وهەروەک داری پڕ بەر لق وپۆپی زۆرترشۆڕ کردۆتەوە . لەوەش گرینگتر هەرگیز لەیادی گەل و نشتیمان و فەرهەنگ ومێژووی خۆی غافڵ نەبووە . بریا ئافرەتی وەک مەستوورەمان زۆربایەوجێگەی ژنانی کورد لە ڕێزی خزمەت بە فەرهەنگ وئەدەبی کورد هێندە خاڵی نەبوایە .

## لەسئوول

## تا بۆکان

# بەدوای تاو...

شاری خنجیلانەی بۆکان مەکۆی جوانی وهونەر و فەرهەنگە. بەڵام ئەمجارە دەمانەوێ بەرەوزانست هەنگاو هەڵبڕین و موختە*ریع بناسێنین .

لاوێکی بە ئیستعداد کە نموونەی کارەکەی لە نوێنگەی «سئوولی» کورەی جەنووبی دانراوە. پێمان حەیف بوو بە خوێنەرانی بەرێزی سروەشی نەناسێنین. هەربۆیە هاتووینە بۆکان تا ئەم لاوە کە ئێنێرژی تاوی مەهار کردووە وئابگەر-مکون و وەجاغی تاوی ساز کردووە بە ئێوە خوێنەرانی بەئەمەگی سروە بناسێنین.

– بەر لە هەمووشت خۆت جوانتر بەخوێنەرانی سروە بناسێنە .

– من کەماڵی کەنکاش قوتابی ساڵی سێهەمی ریازی لەسەر مەهار وهە*ڵدانەوەی ئێنێرژی تاو کار دەکەم و کاروتێکۆشانی خۆم لەساڵی دووەمی راهنمایی یەوە دەست پێکردووە.

– لە کارەکانتدا تا کوێ سەرکەوتووی و چت کردووە ؟

– هەروەکی گوتم لەسەر مەهاری ئێنێرژی تاو کارم کردووە. یەکەم جار ئابگەر*مکونێکی خورشێ*دیم ساز کرد کە رۆژێ سێ لیتری ئاو گەرم دەکرد.

– ئێستا هەر ماوە؟

– نەخێر ! ئەوە لە نوێ*نگەی «سئوول» لە کورەی جەنووبی دانراوە.

دوای ئەو ئو*جاغێکی خورشیدیم ساز کرد کە بۆ شت لێنان کەلکی لێ وەردە-گرین و هەر ئێستا لە ماڵدایە ودەتوانن بیبینن.

– ئەم ئوجاغە پێویستی بە چ هەل ومەرجێکی هەوا هەیە وچەند جێ دەگرێ ؟

– دەبێ دایم تاو لێی بدا وبە پێچەوانەی دەزگاکانی دیکە کە بە هەوریش کار دەکەن ئوجاغەکە دەبێ هەمیشە تاو تێی بکا و جێگاش دەگرێ.زۆر بچووک نیە .

بەدوای ئەمەدا دەزگایەکی دیکەم دروست کرد کە دەتوانێ ئەم شە* و رتووبەتەی لەنێو خاک دایە بەهۆی تاو بیگرێ

و بیپالێوی. ئەڵبەت وەسیلەیەکی زۆر سادەیە و دەتوانین لەسەر ئەو چەشنە زەوی یەی شەدارن دایمە
- زرێنین وشەی خاک دەکێشی .

ئەم دەزگایە بۆ ناوچەی قاقڕ وکەم ئاوی وەک کەویر بەکار دێ کە ناوم ناوە "ئاو هەڵێنج"

ئاخرین وەسیلەی سازم کردووە دیسان ئاوگەرمکونی ئاوی یە کە رۆژێ هەزار لیتر ئاو بە دەمای ٧٠ دەرەجە گەرم دەکا .

ئەم وەسیلە بەم گەورەیی یە دەتوانین بڵێین لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا بێ وێنەیە .

- ئێستا لەکوێیە؟

- لە ئاتەشنیشانی بۆکانە .

- پرسیارێکم هەیە دەمویست لەنێو قسەکاندا بیدرکێنم ئەویش ئەوەیە کە کارەکانی تۆ جەنبەی ئیختراعیان هەیە یاخۆ ئەم کارە لەولاتانی دیکەش کراوە

- مەسەلەی ئێنرژی ئاو زۆر لەمێژ نیە لەدونیادا هاتۆتە گۆڕ. منیش لە هەوەڵەوە پێم شتێکی سەیر و سەمەرە بوو بەڵام دوایی لێی ورد بوومەوە وزانیم لە داهاتوودا هەراوترین تێکوشانی زانستی بەخۆی تەرخان دەکا وئەم مەسەلە بوو بەهۆی ئەوە کە وردتر کاری لەسەر بکەم.

ئێستا لە پلەی زانستگەکاندا کاری لەسەر دەکرێ.ئەوان لەم کارانەیان کردووە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە من زانست وئاگاداریم تا ئەو رادە نیە دەتوانم بڵێم لەگەڵ ناوەندە زانستی یە گەورەکانی کارەکانم شان لەشانی کاری ناوەندە زانستی یەکانی گەورەی جیهان دەدا .

درێژەدان بەم کارە بەتایبەتی بۆ ئێران زۆر پێویستە چون کانی ئێنرژی تێدا مەوجوودە. نەوتمان بەشی بیست وپێنج ساڵی دیکە هەیە ئەویش بۆ سنعەتی پێتڕوشیمی پێویستە و بۆ سازکردنی گۆشت و بابەتی پڕۆتئینی دیکە لە نەوت بەکاردێ. جا ئێمە نابێ ئەوەندەی ماویشە بەختی بکەین .

کانە ئێنرژی یەکی دیکە کە زۆر جێی دڵخۆشی یە ئێنرژی ئەتۆمی یە وئەویش لەبەر چەند هۆ دنیا وردە وردە دێ لێی بپرینگێتەوە. لەسەر ئەوەشەوە زۆر گرانە وبۆمان جێ بەجێ نابێ. بۆشمان جێ بەجێ بێ ئۆڕانیۆم مەحدوودە و زۆر سانی وەدەست ناکەوێ. جا کەوابوو کانی ئێنرژیمان تەنیا ئاوە. ئەگەر ئێستا خۆ نەبزێوین لێمان دوور دەکەوێتەوە. بۆیە بەش بە حاڵی خۆم خەریکم تا ئەو جێگەی لەدەستم دێ لەسەر ئەم مەبەستە کار بکەم.

- ئەگەر دەکرێ کورتە باسێکمان لەسەر ئێنرژی خورشیدی پێ بڵێ کەئێنرژی خورشیدی چیە و بە گشتی کورتە مێژووی حەول ودەولی مەهارکردنی تینی ئاومان بۆ بڵێ .

- ئێنرژی ئاو تائێستا

بەچوار چەشنە مەهار کراوە

یەکەم: "فتۆسەنتز" کە لە هەزاران ساڵ لەمەوبەرەوە گەڵا ئینرژی تاوی وەرگرتووە و بەهۆی کلرۆفیل کردوویە بە ئینرژی. ئەم کارە تا ئێستا لەدەست بەشەر نەهاتووە.

دووەم: "فتۆئێلێکتریک کە تا ئێستا زۆر کاری لەسەر کراوە و ئینرژی تاو راستەوخۆ دەکرێ بەئینرژی ئێلێکتریکی. وەک دروست کردنی سلوولی خورشیدی کە دروستم کردووە و ئەگەر ئیمکانات بدرێ دەتوانم زۆر بەربڵاوتر کاری لەسەر بکەم وتەولیدی بکەم.

سێهەم: مەهاری حەرارەتکە تیشکی تاو لە جێگەیەک کۆ دەکەنەوە و وەک ئاوێنەی موقەعەر یا رفلێکتۆر، یاخۆ بە زەڕەبین کە لەمکارەش ئوجاغی خورشیدی، فەندەکی خورشیدی و ئەوانە دروست دەکرێ. یا دەزگایەکی خورشیدی کەئاسن بتوێنێتەوە یا نیرووگای بەرقی هەتاوی

چوارم: (بەندکردنی حەرارەت) وەختێک تیشکی تاومان کۆ کردەوە و مەهارمان کرد بۆ ئەوە کە بەجوانی کەلکی لێ وەربگرین و نەیەڵین بەفیرۆ بڕوا دەبێ رایبگرین کە من ناوم ناوە زیندانی کردن. جا دەتوانین ئابگەرمکونی خورشیدی و گوڵخانەی خورشیدی، پۆمپی خورشیدی و.... لێ دروست بکەین کە ئەگەر ئیمکان هەبێ من بەڵێنی دەدەم، هەموان دروست بکەم.

- لەم پێوەندی یەدا چ گیروگرفتێکت هەیە ؟

- کۆسپی هەرە گەورەی سەرڕێگای موبتەکرانی وڵات مەسەلەی کەمبوونی ماڵی یە. ئێستا کاری ئێمەمانان میلی میتری یە ئەگەر ئیمکانی ماڵی هەبێ دەبێتە لووم(ئەهروم)ێک بۆ ئەوە رەوەندی کارەکە هەراوتر و بەربڵاوتر بێ.

دوایەش کەم بوونی ئیمکانی فەننی یە لە پێوەندی لەگەڵ کاری ئینرژی تاویدا.

- شێوەی دەرس خوێندنت چۆنە ؟

- من لەبەر چەند هۆ کە پێوەندی بە کاری عیلمی یەوە نیەوتایبەتین ناتوانم بچمە فێرگە و لە لاوە دەرس دەخوێنم.

- وەکی بیستوومە کاری هونەریش دەکەی. ئەگەر راستە لەم بارەشەوە تۆزێک بدوێ.

- وەک کاری هونەری ناتوانم بڵێم هونەر بە مانای خۆی بەڵام چیرۆک دەنووسم وسنارێوم نووسیوە و هاوکاری دەنگ و رەنگی ناوەندی مەهابادیش دەکەم.

- لە کۆتاییدا چ پێشنیارێکت بۆگۆواری سروە هەیە.

- سروە لە باری فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی
- یەوە پوخت وپاراوەبەڵام وتاری زانستی کەمە. ئەگەر رێگا بدەن من زنجیرە باسێکم هەیە کە بەشێکی لە گۆواری "دانشمند"دا چاپ بووە بۆئێوەی دەنێرم بڵاوی بکەنەوە.

- لەسەر چاوان.

# ئاوڕێک وە سەرمێژووی کوردستان

قازی ئەحمەد

تۆفیق وەهبی کوردناسی زانا لە وتارێک لەژێر سەردێری " مادەکان چیان بەسەر هات"دا دەنووسێ «مادەکان بەرە، بەرە لەگەڵ کوردەکان خزمایەتی-یان کرد و تێکەڵ بوون. جا کوردەکانی ئیمرۆ بەرهەمی ئەم پەیوەندەن.»

دوایە دەڵێ:"ناوی ماد بە شێوەی "ماس" یا "ماسی" یا "ماە" لەمێژوودا ناودێر بووە وتا دەورەی هەوەڵی ئیسلام ماەآباد " مەهاباد " لە نووسراوە و سەنەد و بەڵگە مێژوویی یەکاندا هەر وا مابوّوە.»

وەختێک من چیرۆکی دڵداری ومێژوویی "وەیس و رامین"م دەخوێندەوە کە بەرەبەری ساڵی ۴۴۶ی کۆچی فەخرەدین ئەسعەدی گورگانی لە زمانی پەهلەوی یەوە بە شیعر کردوویەتە فارسی لە چەند جێگا ناوی"وڵاتی ماە" یا "ماەآباد"م وەبەرچاو هات کە بۆوەراست گەڕانی قسەی تۆفیق وەهبی دەکرێ وەک بەڵگەیەکی پتەو ئاماژە*ی پێ بکرێ .

" وڵاتی ماە " لەچیرۆکی وەیس ورامین دا بەناوچەی رۆژئاوا وشیمالی رۆژئاوای

ئێران و ئەران و ئەرمەنستان دەگوترا کە پێتەختەکەی هەمەدان بووە وئەم هەرێمە لە مێژوودا هەر ئەو مەڵبەندی مادە .

وڵاتی ئێران لەمچیرۆکەدا زۆرتر لانی رۆژهەڵاتی لەبەر چاو بووە و تا قەراغ ئۆقیانووسی هیند وناوەندی ئێرانی گرتۆتەوە وپێتە ـ ختەکەشی «مەرڤ» بووە .پادشای ئەو سەردەمی ئێران کە زەمانی حوکماتەکەی بۆ ئێمە روون نیە ولە هیچ کوێ، باسی نەکراوە ودەورەو تاریخێکی دیاری کراوی نیە مۆبەدمونیکان بووە و لە «مەرڤ» بنەگر بووە .

لە جێژنی نەورۆزێکدا ئەمیر وحاکمی وڵات و مەڵبەندەکانی جۆراوجۆر بۆ بەشداری لە بەڕێوەبردنی ئەم جێژنە بۆمەرف بانگ هێشتن دەکا .

«شەهرو» خاتوونی وڵاتی ماه (ماد) وێڕای «قارن»ی مێردی و «ویرووی» کوڕی بۆ بەشداری لەم کۆڕە شاهانە بانگ دەکرێن. شا لە هەوەڵ روانیندا کەیفی بە «شەهرو» دێ و خوازبێنی لێدەکا بەڵام شەهروپێی رادەگەیەنێ کە شووی هەیە ومندالی هەیە وناتوانێ مێرد بە شا بکا. شا بە هەڵەی خۆی دەزانێ و رجا لە شەهرو دەکا کە ئەگەر لە داهاتوودا کچی بوو بیداتێ شەهرو سوێندی بۆ دەخوا و بەڵێنی پێ دەدا .

چو شهرو ماهدخت از ماهآباد
چو آذربایگانی سرو آزاد
چنان آمد کە روزی شاهشاهان
کەخواندندش همی موبدمنیکان
بدید آن سیم‌تن سرو روان را
بت‌خندان و ماه بانوان را
بەتنهایی مر اورا پیش خود خواند
بەسان ماه نو برگاه بنشاند
کەمن دارم ترا با جان برابر
کنم دردست تو شاهی سراسر
بەگیتی کامراندن باتو نیکوست
توباشی دربرم یاجفت یادوست
بەکام تو زیم با تو همەسال
ببخشایم بەتو سیم و زر ومال

شەهرو لە وەڵامی شادا دەڵێ :

نەآنم من کە یار وشوی جویم
کجا من نەسزای یار و شویم
نگویی چون کنم با شوی پیوند
ازاین پس کزمن آمدچند فرزند
ازایشان بهترین آزادە ویرو
کەبیش ازپیل دارد سهم و نیرو

ئەوجار شا داوا دەکا ئەگەر شەهرو لە داهاتوودا کچی بوو بیدا بە شا

کنون گر تونباشی جفت ویارم
نیارایی بە شادی روزگارم
زتخم خویش یک دختر بمن دە
بکام دل صنوبر باسمن بە

شەهرو وەڵام دەداتەوە:

نزادم تاکنون دختر وزین پس
اگر زادم تویی داماد من بس
چو شهرو خورد پیش شاه سوگند
بدین پیمان دل شەگشت خرسند

پاش ماوەیەک شەهرو کچێکی دەبێ وناوی دەنێ وەیس . شەهرو مەلۆتکە دەداتە دەست تایەئێک کە کاری بارهێنان وعاملاندنی شازادان دەبێ ولە«خۆزان»نیشتەجێ دەبێ. تایەن لەو دەمەدا رامین براچکۆلەی موبەدی لەبەر دەستدەبێ تا ئەویش

بعاملێنێ و بەخێوی بکا . وەیس دەکاتە ئاواڵی ئەو و لە تەمەنی دە ساڵیدا لێکیان هەڵدەبڕێ. وەیس دەباتەوە وڵاتی ماەورامین بۆ «مەرڤ» بەڕێ دەکاتەوە .

شەهرو شەرت و قەرار لەبیر دەکا و وەیس لە ویرووی کوڕی مارە دەکا ( ڕەنگە زەماوەند لەگەڵ مەحرەم برەوی بووبێ) شای ئێران کە بەم حەیس وبەیسە نازانێ "زەرد"ی برای بۆ لای شەهرو دەنێرێ وشەرت و قەراری وەبیر دێنێتەوە. بەڵام لەو کاتەدا جێژنی زەماوەندی وەیس و ویروو گیرابوو.

" زەرد" بە لارەملی دەگەڕێتەوە وئەوەی دیتوو-یەتی بۆشای دەگێڕێتەوە:

ترا بادا ز شاهی نیکبختی
زمین ماه را تنگی وسختی
زمین ماه یکسر باد ویران
شده ماواگه گرگان و شیران
کجا ویرو است آنجا مهتر رزم
زنادانی شده مغرور در بزم
بەنام اورا همه کس شاەخوانند
جزاو شاه دگر باید ندانند
ترا نه ز شهریاران میشمارند
گروهی خود به مردت می ندارند

شا تووڕە دەبێ و لەشکر دەباتە سەر وڵاتی ماە. لەم شەڕەدا سپای شا دەبەزێ و ویروو بەم خەیاڵەوە کە بۆ هەمیشە شای تێک شکاندووە لەشکر بەرەڵڵا دەکا وشای ئێران بە لەشکرێکی قورس وگرانەوە دەگاتە سەری و وەیس لەگەڵ خۆی دەباتە «مەرڤ».

## وێنەی ڕێنووسی مادی

لەم شەڕەدا ئەم شارو مەڵبەندانەی شای ئێران لەشکری لێ وەکۆ کردۆتەوە، دیاری کراوە. هەرێمی دەستەڵاتی ئەو ڕۆژهەڵاتی ئێران بووە و ناوچەکانی خوراسان و سەند وهیندو جەنووبی ڕۆژهەڵاتی ئێرانی گرتۆتەوە .

لەولاشەوە ویروو لە ناوچەی ڕۆژئاوا وەک ئازەربایجان و خووزستان و ئەمەنستان ودەیلەمان لەشکر تەیار دەکا کو ( سەرزەمینی مادە).

ئەم تێک هەڵچوونە لەنێوان وڵاتی ئێران ووڵاتی ماددا ڕویداوە.ڕەنگە لە زەمانی هەخامەنیشی یا ساسانی یا ئەشکانیدا بووبێ کە ئەو لێزان ومێژووناسان دەبێ ساغی بکەنەوە و ئەم ئەفسانە مێژوویی یە لەگەڵ ڕوودانی ڕاستی ئەو لە مێژوودا لێک بدەنەوە.

هەرێمی کۆکردنەوەی سپای شای ئێران :

فرستادش به هر راهی

سواری
بەهر شهری کە بودش
شهریاری
یکایک را بە نامە
آگهی داد
کەخواهم شد بە بوم
ماەآباد
زطبرستان وگرگان و
کهستان
زخوارزم و خراسان و
دهستان
زبوم هند وسندو تبت
و چین
زسند ووحدتوران تا بە
ماچین
چنان شد درگهش زانبوه
لشکر
کەدشت مروشد چون دشت
محشر

هەریمی کۆکردنەوەی سپای
ویروو :

چو از شاە آگهی آمد
بە ویروو
کە هم زوکینە دارد
هم ز شهرو
زهر شهری واز هر
جایگاهی
همی آید بەدرگاهش
سپاهی
چنان افتاد آنگە چند
مهتر
گزینان ومهان چند
چندکشور
ز آذربایگان وری و
گیلان
زخوزستان واصطرخ و
سپاهان
درآن سوروعروسی پنج
شش ماە
تشستە شادمان درکشور
ماە
بنامە هرکسی لشکر
بخواندند
بسی دیگر زهر کشور
براندند
توگفتی بود بردشت
نهاوند
زبس جنگاوران کوە
دماوند
زکوە دیلمان چندان
پیادە
کەگویی کوە سنگند
ایستادە

پاش ئەوە کە شای ئێران وەیس بەدیل دەگرێ رامین دەبێتە ئەویندار ی وچیرۆکی بە سۆزوکوڵی وەیس ورامین لێرەوە دەست پێدەکا کە کارمان بەسەر ئەو بەشەوە نیە. مەبەستمان هێنانەوەی ئەو شیعرانەیە کە باسی وڵاتی ماە یا ماەآبادی تێدا کراوە.لە جێگەیەکی دیکەدا کەباسی پێک گەیشتنی وەیس ورامین دەکا ،هاتووە:

خۆشا ویسا نشستە پیش
رامین
چنان کبک دری درپیش
شاهین
زهی رامین کەدرباغ
بهشتی
همیشە با گل
اردیبهشتی
هزاران آفرین بر
کشور ماە
کەچون ویس آمدە است
ازوی یکی ماە

توفیق وەهبی لەباسەکەی خۆیدا دەستەڵاتی وردەوردەی ئێلاتی کورد و هێرش و پەلاماری ئەوان لە گۆشە و کەناری ئیمپراتووری ماد باس دەکا . لە چیرۆکەکەدا لەو جێگایە کە باسی هێمنایەتی لە زەمانی حوکماتی هاوبەشی وەیس و رامین دێتەگۆڕێ . ئەو مەبەستە ئیشارە پێکراوە.

بەهر مرزی شدازوی مرزداری
بەهر شهری شدازوی شهریاری
بەهر راهی رباطی کردوخانی
نشستە برکنارش راهبانی
جهان آسودە گشت از
دزدو طرار
ز کردو لوروازرەگیر
و عیار

لەچیرۆکەکەرا وادەردەکەوێ کە هەرچەند وەیس خێزانی رامین بووە بەڵام دەستەڵاتی هەرێمی مادیشی بەدەستەوە بووە.

جهان دردست ویس
داستان بود
ولیکن خاصش آذربایگان
بود
همیدون کشور اران و
ارمن
سراسر بد بدست آن
سمن تن

خودا هەقی بزنی کۆڵە لە شاخدار دەستێنێتەوە و هەقدار بە هەقی خۆی دەگا

دەگێرنەوە بازرگانێک لە مووسڵ بوو. بۆ کاسبی هات وچۆی ئێرە وئەویی دەکرد. جارێکی ماڵ ئاوایی لە ماڵ ومنداڵەکەی کرد و بەرەو سەفەرێکی دوور وەرێ کەوت .

پاش ئەوەی دەگاتە جێ شت ومەکی بە وەزن سووک و بەقیمەت گران دەکرێ و کەل وپەلی خۆی دەفرۆشێ و دەگەڕێتەوە مووسڵ.

لەرێگا زۆر ماندوو دەبێ لەسەر تەختەبەردێک دادەنیشێ تا ماندووی بحەسێتەوە. لە پڕ دوو زەلامی لێ پەیدا دەبن و دەنگی دەدەن :

– کوڕە کێی ؟ چت پێیە؟ زوو بەجێی بێڵە و بڕۆ دەنا دەکوژرێی.

کابرا دەڵێ :

– کوڕە بابم بۆدەمکوژن چتان لەمن دەوێ.هێندێکم شت ومەک پێیە ئەویشم بە ماڵی خەڵک کڕیوە وبۆیان دەبەمەوە.

. رێگر نەک رەحمیان پێ نەکرد تووڕەتر بوون و دەورەیان دا و نووکی خەنجەریان لەسەر دڵی دانا و گوتیان :

– فایدەی نادا دەبێ بت کوژین دەنا لەوانەیە سبەینێ راستی مان لێ بلێی وتووشی گۆڵمەز بین

کابرا کوتی :

– باشە پووڵەکە دەبەن بەرن لەمن گەڕێن. ئاخر بۆ دەمکوژن. کەمم هێناوە درەنگ هاتووم؟ خودا هەڵناگرێ ا کۆشێکم منداڵی سەروپیچکە هەیە.

بەم قسانە جەردە پتر تووڕە دەبن و لەسەر کوشتنی سوورتر دەبن و

دەڵێن :

ئەو قسانە بێ فایدەیە! زمانت ئەوەندە درێژە سبەینێ تووشی کێشەیەکمان دەکەی ؟ روحت بەریە ئاسمانیش هەر دەتکووژین.

– ئەمن بکوژن بەڵام خوێنی من ون نابێ.دەستی هەق تۆڵەتان لێدەکاتەوە !

– مەترسە وات ناکوژین کەس ئاگادار بێ لە جێیەکت داوێین سەد سالی دیکەش کەس نەت بینێتەوە!

– کەسیش نەزانێ خوا ئاگای لێیە. کێوو عەرز و دارو بەرد ئاگادارن.ها... ها...چاو لە ئاسمان بکەن ئەو پۆلە کەوە دەبینن ؟ خاترجەم ئەوانە رۆژێک شاهیدی دەدەن وپێتانەوە دەکەن ! ئەی کەوینە ئاگادار بن ئەوانەدەیانەوێ خوێنی من بڕێژن. ئێوە شاهید بن وەمەیەڵن خوێنم ون بێ .

وێگڕا لەقاقای پێکەنینیان دا و کوتیان :

– کاکی بازرگان بە دار و بەردوزەوی وئاسمان رازی نابێ. کەویش بە شاهید دەگرێ. کەوابوو لەبەر خاتری ئەو کەوانە هەر دەیکوژین با بزانم چۆن کەو دەتوانێ شاهیدی بدا .

ئەوەندەیان گوت ولێی

راستەوە بوون و وەبەر خەنجەریان دا و هەتا روحی لەبەردا ما لێیان دا و هەرکە دڵنیا بوون مردووە و ناجوولێتەوە بە خەنجەر چاڵێکیان بۆهەڵقەند و لە چاڵەکەیان خست. کەل و پەلەکەیان بە شان دادا و لاڕێ تێهەڵبوونەوە.

مانگێک پێچوو. کەس و کاری کابرا هەر چاوەڕێ بوون بەڵام بازرگان نەگەڕاوە. وەحەولەوەلا کەوتن وەدەستیان کردە پرسیار بەڵام سۆراغیان نەکرد. ناچار پەنایان بردە بەر حاکم. ئەویش نەیکردە نامەردی هەرچی ژێردەستی بوو تەیاری کردن ورایسپاردن هەموو کەلێن و قوژبنی وڵات بگەڕێن وهەرچی زووتر خەبەری بازرگان بۆ حاکم بێننەوە.

خەڵک دەستیان کرد بە گەڕان بەڵام بازرگان بە نان داچوو و بە ئاودا خورابوو.

وردە وردە زەمان رادەبرد و ماوەی چەند ساڵی بەسەردا تێپەڕیبوو ئیدی خەڵک لە بیریان چووبۆوە وکەمتر باسی بازرگانی بێ سەروشوێنیان دەکرد.

کەس وکاری دەستیان لە هاتنەوە وسۆزەی بازرگان شوتبوو.

رۆژێک دوو کەس هاتنە بارەگای حاکم. کاریان بوو نۆکەر بە حاکمی راگەیاند

- دوو میوانمان هەیە! لە دوورەوە هاتوون. کاریان هەیە! چ بکەن ؟

- نانیان بۆ دانی..

دوایە وچانێک بدەن، ئەگەر حەسانەوە بیانهێنە.

نۆکەر چوو نانی بۆ بردن. بە ئەمری خودا ئەو رۆژە کەویان سوور کردبۆوە. نانیان لەپێش دانان. نۆکەر پاشەوپاش کشاوە و وەدەرکەوت. هەر کە دەرگای پێوەدا گوێی لە قاقای میوانێک بوو. خۆی گرت بزانی بە چی پێدەکەنێ جوان ورد بۆوە. یەکیان کوتی :

- کوڕە بەچی پێدەکەنی

- جا چووزانم بەو کەوە سوورکراوە!

- چیەتی ؟ ناخۆشە؟

- نا... بەڵام لەبیرتە بازرگانێکمان کوشت کوتی کەوێنە شاهید بن. بەوە پێدەکەنم. ئەوەتا شاهیدەکەش سوور کراوەتەوە وەدەیخۆین.

نۆکەر گوێی لەم قسە بوو. بە لەز چووە لای حاکم و حاڵ وجەریانی بۆ گێڕاوە. کوتی :

- دەزانم بازرگانی بێ سەروشوێن چێ لێ بەسەر هاتووە ؟

- بە چی دەزانی ؟

- بە قسەی ئەو میوانانە.

حاکم دەستووری دا دوو میوانەکە بگرن. بانگی کردن و لێی پرسین.

لەترسان نەیانوێرا حاشا بکەن وهەموو شتیان گوت.

حاکم هەردووکی بە سزای خۆی گەیاندن.

**تەواو**

## ٢

**ئەحمەد شەریفی**

### هۆدە بچکۆلە

لەم تاق وهۆدەبچکۆلەدا* وێنەی شاپووری دووەم و کورەکەی شاپووری سێهەم، هەڵکەندراوە.هەردووک بەپێوە راوەستاون ،لیباسی شایە- تی یان لەبەر و جووقەی* شایەتی یان لەسەرە. دەستی راست وچەپیان لەسەر گوێی شمشیر داناوە. لە شانی راست وچەپیان دووکەتیبەی ٩ دێری بەخەتی ئاوێستایی هەڵکەندراوە کەهەرکام چەند وشە وپیتیان بەهۆی تێپەرینی زەمان رەش بووەتەوە. ئەم کەتیبانە لەساڵی ٣٨٨ ٣٨٣ ی میلادیدا هەڵکەندراون

### وەتاغە گەورە

شێوەی گوڵکاری و رازاندنەوەی ئەم وەتاغە پێشاندەری پێشکەوتی هونەری ساسانی بەتایبەتی خوسرەو پەرویزە. لەبەر دەرگای کەوان ئاسای هۆدەکە، لە شانی چەپ و راستەوە دوو پنجەگوڵی گەورە هەڵکەندراون لە سەرووی وان شکڵی دوو فرشتە کێشراوە کەبەراستی جوانن .هەریەکە دوو باڵی جوانیان لەسەر شان بەرز بۆتەوە، بەدەستی راستیان "فەرەی ئیزەدی"*یان هەڵگر- تووە وهەریەکە جامێکیان بەدەستی چەپە گرتووە کە رەنگە ئارەق یا شەرابی پیرۆزی "هۆم" بێ. لە نیوانیاندا تاجێکی بچکۆلانەی جوان کێشراوەتەوە

فریشتەی دەستەراست زۆر جوان ماوە بەڵام ئەوی دیکە بەشێکی زۆری لەشی فەوتاوە وتەنیا سەروچاوو کەمێک لەدەستی ودوو سێ بست لە لاقی ماوە.

دەوراندەوری هۆدەکە بە چەشنە گوڵێکی وەک لاو لاوە رازاوەتەوە .

### تاقی گەورە

وێنەکانی نێو هۆدەکە دەکرێ بکرێنە پێنج بەش.

١- شکڵی سەروو خوسرەو

پەرویز بەجلکی شایەتی یەوە لەنێوان پیری پیران ( مۆبیدی مۆبیدان)وخێوی ئاو(ئاناهیتا ) راوەستاوە.

پیری پیران کە لە شانی راستی خوسرەوەوە حەلقەی فەڕەی ئیزەدی بە دەستەوە، دەیەوێ بیدا بە خوسرەو. خوسرەویش دەستی چەپی بۆ راداشتووەو دەستە راستیشی لەسەر گوێی شمشیر داناوە .

لەلای چەپەی خوسرەو پەرویز ئاناهیتا بەجل و بەرگێکی رازاوە وێستاوە. جەڕەیەکی ئاو(بە نیشانەی رووناکی، ئاوی زۆرو زەوەند ئاوەدانی ،زەنویری مووچە و مەزرا.) لەسەر شان داناوە بەدەستە چەپی گرتوویەتی. گۆزەیەکی بچکۆلەشی بەدەستە راستەوە کە دەیەوێ ئاوەکەی برێژی ئاو هەتا بەرپێی خوسرەو هاتووە کە ئەویش نیشانەی باران و ئاوی زۆر بۆ ولات و بەختەوەری وشادی ژینە بۆ خوسرەو .

ئاناهیتا کراسێکی ئاودا*مێنی کوردانەی لەبەر دایە، کۆڵوانەیەکی بەشان داداوە ولکی کۆڵوانەکەی لەپێشەوە گرێ داوە.کلاوێکی لەسەرە کە وەک سەرکلاوەی، خوری ومەرەزی کوردان دەچێ سەروچاوی هەرسێکیان شکاوە

با ئەوەش بڵێم کە پەرستگە ومێهراوی ئاناهیتا ئێستاش شوێنەوارەکەی لە شاری کەنگاوەر لە ٨٥، کیلۆمێتری رێی هەمەدان -کرماشان ماوە.

**شکڵی دووەمی نێو تاقەگەورە**

لەلای خواروو خوسرەو پەرویز بەسواری ئەسپی بەناوبانگی شەودیز نیشان دراوە. لەم شکڵەدا خوسرەو تاجی شایی لەسەرە. نێزەیەکی گەورەی بەدەستی چەپەوە ومەتاڵێکی زلی بەدەستی راستەوەیە.

شەودیز زین ورەختێکی رەختەی پێوەیە.لەپێشەوە لەسەر یاڵەوە تا سەرچۆکان وسەرشانی زرێی گوڵداری لەبەردایە ولغاوو سەربەندی بە گۆسینگ رازاوەتەوە.دەم وچاوی خوسرەو و ئەسپەکە شکاوە.شەودیز لەساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی لاقێکیشی لەدەست داوە. لە چەپ وراستی ئەم پەیکەرەدا دوو ستوون هەڵکەندراون کە سەرستوونەکەیان بە گوڵ رازاوەتەوە .

**شکارگەی خوسرەو**

وێنەی راوگەی خوسرەو کە لە دوولای وەتاغەکە هەڵکەندراون نیشانەی ئەو پەڕی هونەری کەندەکاری ئەو سەردەمەن.ئەم شکڵانە کە لە پارک و راوگەی خوسرەون بە دەیان شکڵ ووێنەی جۆربەجۆر راوی پارک ونێوئاو نیشان دەدا.

لە چەند جێگە خوسرەو بە سواری ئەسپ خەریکی راوی بەراز ومەڕو وبزنە کێوی وئاسکە. لە چەند جێگە لەنێو لۆتکەخەریکی کەیف ونەهەنگە و ژنان چەنگ وپیاوان بلوێری بۆ لێدەدەن . لە وێنە کەندەکاری یەکانی لای راستە پێنج ژن ولە ئەوانی لای چەپە شەش ژن چەنگ و روباب لێدەدەن لە چەند جێش ژنان بەسواری ئەسپ وفیل خەریکی راوو شکارن. لە سەحنەیەکدا خوسرەو بە تیروکەوان وەدووی رەوە ئاسکێک کەوتووە. ژنێکیش بەسواری ئەسپ لەدووی، غار دەدا. رەنگە ئەمە شیرینی ناوداری خوسرەوبێ بەڵام سەروچاوی شکاوە .

لەم راوگەدا شکڵ و وێنەی ئەم حەیوانانە هەیە ئەسپ ،فیل ، کەرگەدەن بەراز، بزنەکێوی ، مەرە کێوی، ئاسک ووشتر و..... بەڵام تەنیا مراوی یەک لە باڵندان لەم نێوەدا هەیە کە خەریکی کایە کردنە.

وێنەگەلێ ئەم تاقە گەورە دەبێ لە نێوان ساڵەکانی(٦٢٨ـ ٩٥٠)ی میلادیدا ساز کرابن .

با ئەوەش بڵێم کە لە دەورانی ساسانیدا لەم

ناوچەیە قوڕغ وپارکێکی تایبەتی شایانی بووە کە ئەم پارکە لەسەر پردی رازئاوەری ئێستا واتە پازدە کیلۆمێتری کامیارانەوە دەستی پێدەکرد ولەدەربەند ومیان دەربەندەوە بەرەولای کرماشان دەهات . هەتا دەگەیشتە شاروچکەی بێستوون لەوێوە بەناوچەی چەمچەماڵ و نۆژیاوەران دا بەرەولای کەنوڵە هاتووە ولەوێشەوە بۆناوچەی بێلەوار چووە و تێکەڵ سەرقەڵای قەیسی وەند ومیان دەربەند بووەتەوە.. بەم پارکەیان گوتووە : "پارادیس"*

لەم قوڕغەدا ورچ و بەراز و رێوی و کەمتیار هەیە وبزن وئاسکیش لە بەرزایی یەکانی عەودالان و داڵی خاندا زۆرە .

ئەم مەڵبەندە هەتا ئەم ساڵانەش هەرقوڕغ کرابوو لە وێنەکانی راوگەی تاقی وەستان دەردەکەوێ کە ئەو پارادیسە وەختی خۆی تەیمان* و پەرژینی بووە .

**تاقە گەورە**

ئەم بەشە لە شکڵ و نووسراوەی تاقی گەورە لە دەورانی فەتعەلیشای قاجاردا هەڵکەندراون .

لەم شکڵەدا فەتعەلیشا لەسەر کورسی دانیشتووە . ژنێکی باریکەڵەی لەپشت سەرە. لیباسی شایەتی لەبەردایە وشیری بەقەدەوە لە پێشەوەی پیاوێک راوەستاوە کە دەڵێن حاکمێکی زەنگەنەیە . هێندێک لەولاتر کەتیبەیەکی عەرەبی هەڵکەندراوە.

با لە کۆتایی ئەم باسەدا بڵێم کەدەوروبەری بێستوون چەند کوتە بەردی گەورە وچکۆڵەی لێ دۆزراوەتەوە کەناوی (موزداکورد) یان لەسەر هەڵکەندراوە . پرۆفسۆر گردکرۆپ کە ڕۆژهەڵاتناسە دەڵێ :

**موزداکورد** بەردتاشێک بووە کەدەبێ کەندەکاری بێستوون یا تاقی وەستان یادگاری ئەمکابرایە بووبێ جا ناکرێ بڵێین کە ئەم موزداکوردە فەرهادی ئەفسانەیی و بەردتاشی بەناوبانگە کە ئاشقی شیرین بووە ؟

بەڵام لەبارەی ناوی تاقەکەوە من پێموایە کە دەبێ تاقی وەستان راست بێ چون ئەم جێگەیە لە سەر رێگەی دوو پێتەختی ساسانی(تیسفوون وبیشاپوور) هەڵکەوتووە. شای ساسانی لەکاتی هات وچۆ بۆ ئەم دوو پێتەختە لەپاڵ چیای بێستوون وپێرودا کۆشک و سەیرانگەی حەسانەوە و وچانیان ساز کردووە و پێیان گوتووە تاقی وەستان واتە جێگەی حەسانەوە.

پاشان لە بەرەوە بۆتە تاقی بستان .جا گۆڕانی پیتی ب بە و زمانە، ئێرانی یەکاندا وەک زۆر سانی یە .

وەک وەهار بووە بەبەهار واران بووە بە باران،ئاو بووە بە ئاب .....

# چەڵتووک

ح. رەشیدی زەرزا

من برینجی گردەی رووتم
نانم، رسقم، ژینم، قووتم
شەڕمە لەگەڵ «گۆخڵ»* بەتا
زەجرم دەدا پەیتا پەیتا
نازانێ چۆنم داچێنێ
چۆن لە «باستر* غەم» دەربێنێ
بەخۆمەوە نەدی خۆشی
بێ «پاستاو» و بێ «تاڵخۆشی»
لێم نیشتووە زۆر تۆز وگەرد
قەوزەم بووە بە تاشەبەرد
لێم هاڵاوە جلە وەک زنج
دایکوتاوە لە دەورەم پنج
منیش زەویم سندە پێدا
شەی ئاوم کێشا بەوێدا
«پێتاو»* نەبوو لێم بگرێ ڕێز
لێم تێکچوو بایە «مارەگوێز»*
شێلەگەم هەموو خرا بوون
تیرەم لێ هەڵا بوون

لە «چەنبەر»* و لە «خوونەدان»*
لە وەختی «کۆڵنەمەو»* «تەپان»*
بەرەنگاری تۆز و خۆڵ بووم
یەکجار کەنەفت و کلۆڵ بووم
بە قەولی «گوخڵانە»* دانێ
گەیمە قەرەنیمەی دوانێ
ئەوەی بوو بە پاشەکەوت
وەبەر «هێنگی»* دینگی کەوت
هیندێک هەرمان وەکوو بەرێ
هیندێک لەتوێخ هاتنە دەرێ
من و دنیای تەنگ و تاریک
مەکۆی دینگی وەها باریک
ویستی هاڕینی من بوو بەس
تا رزگار نەبم لە قەفەس
بێنێ و بمبا لە دینگیدا
نرکەم ببڕێ لە سینگیدا
بەڵام نەک هەر دزێو نەبووم
چی وا کەمتر لە زێو نەبووم
ئەوجار لێم کەوتە تەڵەکە
خەمی لێکردم کەڵەکە
کەچی پێمگوت: بەسە زوڵم
زەفەر نابەی بە کاکڵم
زوڵم بەری تەنکە تەسکە
وەرە تۆبێ و خودا بەسکە
دڵت بە «پاکانەم»* پاکە
بەند و جۆگەلەم بۆ چاکە
بێ سوودە ئەم گزە و تووکە
گردە ناگۆڕی چەڵتووکە

# ئێمە و خوێنەر

**بانە :کاک سەلامی محەممەد پوور**

جۆکێکت لەگەڵ نامەکەت گەیشت .گلەییت کردووە، بۆناوت لەئێمە وخوێنەردا نەهاتووە. هیوادارین گلەییت نەمێنێ و ناوی خۆت لە سروەی ١٧ دا بدۆزیەوە .

**نەغەدە :کاک عومەر عەبدی .**

پاش سڵاو لە جوابی پرسیاری یەکەمتدا دەڵێین کە گۆواری سروە پاش مەرگی مامۆستاهێمن کەم و کەسری پەیدا نەکردووە . بەڵام پاش ئەوەی بریارمان دا گۆوارەکەمان ببێتە مانگانە لاپەڕەکانی بۆتە ٦٨ لاپەڕە .

لە وەڵامی پرسیارەکەی دیکەدا رادەگەیەنین کە مامۆستاهێمن لە تەمەنی ٦٥ ساڵیدا بە سەکتەی قەلبی ئەمری خودای بەجێ هێنا .

**سەردەشت :سوێسنایەتی بێورانی سەرێ: کاک ع.آ .**

سەلاحەدینی ئەییووبی تا ئەو جێگایەی ئێمە بزانین تەنیا لەرۆژهەڵاتی نێوەڕاست بەتایبەتی میسرو شام وفەلەستین دا فەرمانڕەوایی کردووە و بەرەو، چین نەرۆیشتووە و هیچ بەشێکی لە چین نەگرتووە .

**سەردەشت : ئەبووبەکر حاجی مەحموودی قازانی .**

کورد گەورەپیاوی زۆر بوون و دەتوانی لەم پێوەندییەدا کتێبی"مشاهیر کرد" نووسراوەی بابامردوخ رووحانی وەخوێنی. ئێمەش لە هەموو ژمارەیەکی سروەدا باسی زانایان و شاعیران و هونەرمەندانی کوردمان کردووە و درێژەش بەم وتارە دەدەین.قسەی "پیاوە قەدیمییەکان" بەلای ئێمەوە زۆر بەنرخە. بۆمان بنێرە. سروە بەو هۆیەوە چکۆلە بۆتەوە چونکە مانگانە بڵاو دەبێتەوە .

جوغرافیای شارستانی سەردەشتمان بۆ بنێرە بەتایبەتی لەسەرچاوەکەشی ئەگەر دەکرێ نوسخەمان بدەیە. بە هیوای درێژەی هاوکاریتان .

**بۆکان : مەحموود ش. ه .**

* "دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە" فەرمووتە کوا ئەو پەندە راستە. زۆرکەس هەن زۆر ماندوون و هەر برسین زۆرکەسیش هیچ خۆ ماندوو ناکەن وزۆر تێرن. رەنگە ئەوە بە دەگمەن دەربارەی هێندیکاندا راست بێ. بەڵام ئەگەر هەراوتر بڕوانی دەبینی کە هەموو پێشکەوتن وسەرکەوتن و پێگەیشتنێک بەرهەمی تێکۆشان و ماندووبوونە، کام نەتەوە، کام گەل کام کۆمەڵی ئینسانی بێ تێکۆشان سەرکەوتوون ؟ کام نەتەوە بە تەمبەڵی و پاڵدانەوە بۆتە نەتەوەیەکی سەرکەوتوو ؟

* لەهەموو ژمارەیەکدا باسی هونەرمەندێکمان هەیە ودرێژەش بەوکارە دەدەین .

* واژەی ئافرەت ، یا عافرەت بەبیروڕای هێندیکان لە "عەورەت"ی عەرەبی را هاتووەو ئەگەر شاعیرانەش بیر بکەینەوە "ئافرەت"

هەمان "ئافرۆدیت"ە کە بە زبانی یۆنانی ناوی "ڤێنووس" خودای جوانی یە و خواژنە .

بانە :**کاک مەنسوور سەلیمی**

گلەیی درەنگ بڵاو بوونەوەی گۆواری سروە گلەیی هەموو خوێنەرانی سروەیە. نەبوونی کاغەز تا ئێستا هۆی ئەو وەدرەنگ کەوتنە بووە. هەواڵمان پێ گەیوە کە کاغەز پەیدا بووە و هیواداریین لەمەودوا گۆوارە-کەمان لەکاتی خۆی دا بڵاو بێتەوە .

پیرانشار: **کاک محەممەد محەممەدی موحەسیلی**

دڵت ناشکێنین وجوابی پرسیارەکانت دەدەینەوە :

* سروەی ژمارە ٥ هاوکات بوو دەگەڵ مەرگی مامۆستا هێمن و بابەت و شیعری زۆرتر بۆ هاتبوو بە هۆی زۆرتربوونی لاپەڕەکانی.

* پرسیاری دووهەم ئەوەیە بۆچی سروە پڕە لە باسی یەکسم وشتی وا:

ئەو وەڵامە بۆ هەموو ئەو کەسانە کە ئەمچەشنە پرسیارەیان هەیە لێرەدا بڵاو دەکەینەوە :

هێندێک رەسم و شوێن هەن کە بەهۆی ئاڵ وگۆڕی کۆمەڵایەتی وئابووری یەوە خەریکن فەرامۆش دەکرێن . هەر رەسم و شوێنێک فەرهەنگ و ئەدەبیاتی تایبەتی خۆی هەیە کە ئەگەر نەنووسرێ و سەبت نەکرێ دەمرێ ولە دەست دەچێ .

باب و باپیرانی ئێمە هەموویان ئەسپ ومایینیان هەبووە و بۆ هات وچۆ کەلکیان لێ وەرگرتووە ، ئەسپ وئێستر و وشتر و گوێدرێژ لە جێگای ئۆتومۆبیل و وانێت بار و کامیۆن وقەتار و فڕۆکەو شتی دیکە پێوەندی شارستا-نەتی یان پێک دێنا . سەرداران و گەورەپیاوانی مێژوو لەجێگەی تانک و نەفەربەر وجیپ و زرەهی و فڕۆکەی شەڕ تەنیا ئەسپ وچاروای دیکەیان هەبوو. تەقڵە وڕمبازی وهەوهەوی سواران بەزمێکی سەرنج راکێش بوو. سەیفی قازی دەڵێ :

لاڵ بم نابینم خێل بەرەو خواران
تەقڵەوڕمبازی وهەوهەوی سواران

بەڵێ ئێستا کە یەکسم وردە وردە پاش هەزاران ساڵ خزمەتی بێ وچان جێگەی خۆی دەدا بە ماشێن پێویستە لانی کەم ناونیشان و فەرهەنگەکەی بۆبەرەکانی داهاتوو کە رەنگە تەنیا لە باغی وەحشەکاندا یەکسم ببینن بپارێزین .

بەری پیرانان قەلاتەرەش:

زۆرمان پێخۆشە لەمەڕ ژیانی فەقی یان وتار بڵاو بکەینەوە. هەرکەس بۆمان بنێرێ بەو مەرجە باش بۆ بڵاوی دەکەینەوە.

نامەی ئەمئازیزانەشمان پێگەیوە وکەڵکیان لێ وەردەگرین .

ورمێ :**گوندی بازۆڕ. یوسفی عەبباسی**

بۆکان:
**سەیید عەبدوڵڵا خوسرەوزادە، تەها خوسێنی - محەممەد سولەیمانپوور - کەریم کەریمی - م.س.ه**

بانە:
ئەحمەدکەریمی - **عەولەبی حوسێنی**

**بانە**: بوئین عولیا
**سەلام محەممەدپوور**

پیرانشار:
**محەممەدوەسیمی موحەسیللی**

تەورێز :**سەیدکەماڵ لەتیفی**

دزفوول :
**حەسەن ئەمینی - شێواو**
**ه . ق**

سەردەشت - بێورانی سەرێ :
**ع. آ**

سەقز: **فایق ن.س**

شنۆ: **بێکەس**

مەهاباد: **کەماڵ .م**

مەریوان :**سولەیمان شوکری**

مەریوان.گوندی ئەحمەداوا
**عوسمان محەممەدعوسمان**

نەغەدە: **عومەر عەبدی - محەممەد رەحمانی**

ئەم تەنزە نووسراوی **مارک تواین** نووسەری بەناوبانگی ئەمریکایە و خوشکە **ئازادە فەرزانە** لە فارسی یەوە کردوویە بە کوردی

# سەعاتی من...

سەعاتەجوان وچاکەکەم، لەوسەعاتانەی ئێستانەبوو بۆیە وادەڵێم بەچاکی کاری دەکرد لەوسەعاتەگیرفانیانە بوو کەبەزنجیرێکی زەردەوە. بەسترابوودەمخستە گیرفانی تایبەتی سەرسینگیم وبە لارانەوەی زنجیرەکەی بەسەر سینگمدا زۆر خۆمبەبەختەوەر دەزانی.

ماوەیهەژدەمانگ بوو کڕیبووم لەوماوەدابێ ئەوەی لەکاربکەوێ یاناکۆکێکی زۆر چکۆڵەشی لێ بەدی بکرێ بێ وچان کاری دەکرد. ڕێنو- ێنییەکانی ئەوسەعاتەم لە پێشاندانی کات وزەمان دا ئەوەندە راست ودروست دەدی کەوردەوردە هاتبوومەسەرئەو باوەڕەکەپێچ وفەنەر و شتەکانی دیکەی ئەوسەعاتە ئەبەدین وقەت خراپ نابن!

شەوێک لەکاتی قورمیش کردنی دا لەناکاو لەدەستم کەوتەخوار لەورووداوە زۆر، دڵتەنگ وناڕەحەت بووم، دڵم خەبەری دەدا کە دوای ئەم رووداوە مقەدەر وناخۆشی گەورەم بەسەردێت، بەڵام بەهەر چەشنێک توانیبام دڵداریخۆمم دەداوە ئەوبیروبڕواخراپانەم لەمێشکم دووردەخستەوە لەگەڵ ئەویشدا بۆ ئەوەی دڵم بە یەکجاری ئاسوودەبێت، بۆ بەیانی ئەوشەوەیکەسەعاتەکەم لەدەستم کەوتەخوارەوە، بردمە دووکانی گەورەترین وبە ناوبانگترین سەعات سازیئەو شارە، چاوی پێ بکەوێ وئەگەر نیازی (پێویستی) بەرێک‌کردن بێت چاکی کاتەوە.

کاکی سەعاتسازی بە ناوبانگ، سەعاتەکەی لەدەستم وەرگرت وبەوردی لێی روانی وتاقی کردەوە ونایەگوێیەوە وگوتی: چوار دەقیقە لەدوایە دەبێ توزیک توند بکرێتەوە من زۆر هەوڵمدا تا لەوکارەی پەشیمان بکەمەوەوحاڵی بکەم کەسەعاتە خۆشەویستەکەم پێویستی بەهیچ چەشنە دەست کاریەک نیە، بەڵامبەهیچجۆرێک بۆم حاڵی نەکرا و تەواوی هەوڵ دانەئینسان دۆستانەکەم نەیتوانی ئەو لەوخەیاڵە حەیوانیە، کەسەعاتەکەم چوار دەقیقە لەدوایەو دەبێ توند کرێتەوە، پەشیمان بکاتەوە. لەوکاتەدا من بەناڕەحەتی ودڵەکوتەی زۆرەوە لەدەوری، دەگەڕام وبەقوربان وسەدەقەی دەبووم‌کەدەست لەسەعاتە هەژارەکەم هەڵگرێ وچێوەژەنەو* وخرتەی نەدا، کاکی سەعات ساز بەوپەڕی هێمنی ولەسەر خۆیی‌یەوە پشتی سەعاتەکەی

هەڵپچڕی وئەوکارە ناشیرین
وناحەزەی جێ بەجێ کرد .

لەو رۆژەوە سەعاتەکەم
رۆژلەرۆژ زیاتر هەڵ دەهات
وغاری دەکرد . لەماوەی
حەوتوویەک دا ئەوەندەی یاو*
بوو کەنەبزێ لەدەقیقەدا!
سەدوپەنجا کەرەتی لێ دەدا!
دوای دوومانگ بەجێگەیەک
گەیشت کەلەباشترین کرۆنۆمتری
شار وەپێش کەوت ولەرووی رۆژ
ژمێرەوە ١٣٥ رۆژکەوتبۆ پێشەوە.
سەعاتەکەم کاتێک هێشتا پاییز
تەواو نەببوو ولە مانگی
سەرماوەزدا بووین،لەبەفرو
سەرمای زستانی مانگی
بەفرانبارهەڵ دەلەرزی. کرێ
ماڵەکەم زۆر زوو وادەی
دەگەیشت ئەوندەی گیروگرفتی
جۆربەجۆرسازکرد ، کەناچار
بووم بۆلای سەعاتسازێکی تری
بەرمکاکی سەعاتساز ئەمجارە
لێی پرسیم :

"ئایا تائێستا ئەم
سەعاتەت بردۆتە لای سەعاتساز؟

جوابم داوە :"قوربان،قەت
قەت تائێستا سەعاتەکەم
پێویستی بەچاک کردنەوە،
نەبووە وزۆر جوان کاری
کردوە ؟"

کاکی سەعاتساز بەوپەڕی
رووخۆشییەوە ،تەماشای کردم
بەلام نیگای دەغەڵکاری
لێ دەباری . دەس بەجێ
سەعاتەکەی کردەوەو ،
"زەرەبینێکی" چکۆلەی‌نەحلەتی
کردەچاو ولەماکینەکانی
وردبۆوەوبەدەنگێکی بەرز
دەمن راخوڕی وگوتی:

- ئەم سەعاتە دەبێ خاوێن
بکرێتەوە وچەور بکرێ تا
دوایی رێکی بکەم بڕۆ
حەوتوویەکی تروەرەوە ؛"

دوای حەوتوویێک چوومەوە ،
سەعاتەکەم پاک و خاوێن
کرابۆوەو چەورکرابوو ورێک
کرابوو ، هەڵمگرت وهێنامەوە

سەعاتەکەم دەستی بەکار
کردەوەوبەلام زۆر لەسەرخۆو
بەویقار کاری دەکرد. وەک
دەنگی زەنگێک وابوو کەلە
دوورەوەببیسترێ ولێدانەکەی
بەینی بێ . وردەوردەلەهەموو
کارەکانم دەبووم . کاتێ
گەیشتمە وێستگەی شەمەندەفەر
کەرۆیشتبوو ،کاتێ دەمەویست
قەرزەکانم بدەمەوە زۆر لە
ماوەی گوزەرابوو . ئەگەر بۆ
شوێنێک میوان بووما یەکاتێک
دەگەیشتمێ کەئیتر کەسی
لێ نەمابوو . سەعاتە
خۆشەویستەکەم لەدانەوەی
قەرزدا زۆر مۆڵەتی پێدەدام
وپەلەی لێ نەدەکردم" کاتێ
ئاگاداری دانەوەی قەرزەکانی
دەکردم کەزۆری لەوادەیان
لادابوو ئیتر شکایەتیان
لێ کردبووم کار گەیشتبووە
دادگا . هەوڵ جار رۆژێک و
ئینجار دوو رۆژ لەژیان
دواکەوتم تەواوی خەڵک لە
ژیانی ئەمرۆ کەڵکیان
وەردەگرت بەلام من هێشتا
گیرۆدەی پێروبەسرپێربووم
هەستم دەکرد کەلەنێوان
حەوتووی پێشوودا تاق وتەنیا
ماومەتەوە جیهانی زیندوو
لەمن رابووردوە وخەریکە
لەپێش چاوم ون دەبێ.

وردەوردە خەریک بووم
بچمەریزی مێژووەوە . هەستم
دەکرد لەمۆرومێوکراوانی
"مومیائی" مێژووخانەکان
(موزەها )زۆرخوشم‌دیت وزۆر
حەزم دەکرد برۆمەلایان تا

سەبارەت بەتازەترین رووداوە
ـ کانی جیهان ئاگاداربم
وخەبەریان لێوەرگرم . ناچار
دیسان چوومەخزمەت سەعات
سازێکی تر . کاکی سەعات ساز
ئەم جارەبێ مەحتەلی تەواوی
سەعاتەکەی لەپێش چاوی منی
بەدبەختدا لەتلەتکرد و
بەوپەڕی خۆشی وفیزوئیفادەوە
گوتی:

"میلی سەعاتەکەت ماسیوە*
"پەرچووتووە"اسی رۆژی پێ
دەچێ تاماسینەکەی بنیشێتەوە
وبگەڕێتەوە حالی ئاسایی
خۆی . دوای ئەم چاک ،
کردنەوە سەعاتە هەژارەکەم
رێورەوشتێکی تایبەتی پەیدا
کرد . تانیوەرۆ دەیقلخاند
وەک سەگ دەوەڕی ، هاواری دەکرد
دەپشمی ،هەناسەی هەلدەکێشا
دەینالاند وبیروهۆشی منی
بە تەواوی خراپ کردبوو ، بە
چەشنێک کەهیچ سەعاتێکی تر
نەیدەوێرا تخوونی بکەوێ بەلام
لەنیوەی تری رۆژدا دەخەوت
یان سەبرکاری دەکرد ،لەنیوەی
رێدا مەحتەل دەبوو ،رادەوەستا
هەتاتەواوی ئەوساعەتانەی
کەلەوبەجێ مابوون بیگەنێ
ولەدوای ٢٤سەعاتدا بەسەر
سوڕ ماوی نەتدەتوانی هیچ
ڕەخنەیەکی لێ بگری چونکە
کاتی بەدروستی نیشان دەدا
دیسان بەناچاری بردمە لای
سەعاتسازێکی دیکە . کاکی
سەعاتساز ئەمجارەگوتی:
میلی قورمیشەکەی شکاوە .

من لەوە کەشوکر ئاخری
عەیبێکی ئەساسی تێدا دۆزراوە ،
زۆرخۆشحال بووم وبێ ئەوە
کەمیلەی قورمیش بناسم وبزانم
چ دەکا ولەکوێدایە تەنیا
بۆئەوە خۆم لای سەعاتساز
بێ خەبەر نیشان نەدەم هەرچی
کاکی سەعاتساز دەیفەرموو
خێرا بەلێم بۆ دەگوت
فەرمایشتەکانیم قەبوول دەکرد
ئەمجاریش سەعات چاک کرایەوە
بەلام چ چاکرانەوەیەک چەند
دەقیقە کاری دەکرد ولەخۆوە
رادەوەستا دوای چەند دقیقەیە
ـ کی تر دەستی بەکاردەکردەوە
ودیسان بێ هیچ شەرم وحەیایەک
رادەوەستا ، ولەهەر دەس بە
کار کردنەوەیەکدا وەک

تفەنگی برنەو لەقەی دەخست
چەشنێک کەمن ناچار بووم
تۆپەلێک لۆکەبخەمە ژێر
سەعاتەکەوە تاسینگم کون
نەکا .

ناچار دیسان چوومە لای
سەعاتسازێکی دیکە . ئەویش
پاش ئەوەی کەبێ مەحتەلی
تەواوی چەرخ ومەکینەکانی
هەلرشت وخستیە ژێر (زەرەبین)و
گوتی:

قورمیشەکەی خراپە ، بە
خەیالی خۆی قورمیشەکەی
چاک کردەوە و سەعاتەکەی
خاوێن کردەوە ودایەوە دەستم
ئەم جارە ئیتر سەعاتەکەم
زۆر جوان کاری دەکرد ،ئەوندە
نەبێ کەعەقرەبەکانی لەهەر
سوورانێکا وەکدەمی مقەست
دەیان ، ویست تابۆیان
بکرێ یەکتر لەئامێزبگرن
وپێکەوە ولە ئامێزی یەکا
دەست لەگەردن بەوحالەتە
شاعیرانەوە بسوورێن ئێوەش
بێ گومان وەک من پێتان وایە
کەگەورەترین فەیلەسووف

وزانای دونیاش ناتوانێ لە روی ئەم سەعاتەوە بزانێ بە دروستی سەعات چەندە.
بەناچار بۆچاک کردنی ئەم عەیبەش چوومە خزمەت سەعات سازێکی دیکە .

ئەمجارە کاکی سەعات ساز روونی کردەوە کەعەیب لە شووشەکەیدا یە ،کەعەقرەبەکان گیر دەکا وناهێڵێ بەجوانی بگەرێن،هەڵبەت چەرخ و ماکینەکانیش هەندێک پێویستیان بەچاک کردنەوەیە کاکی سەعات سازبەوپەڕی رووخۆشیەوە سەعاتەکەی چاکردوەو دایە دەستم .

ئیتر سەعات هیچ عەیبێکی نەبوو وهیچ رەخنەی لێنەدەگیرا. جگەلەعەیبێکی بچووک، ئەویش ئەوە بوو دوای ئەوەی کە سەعاتەکە تائێوارە کاری ، دەکرد ،لەناکاو تەواوی ماکینە جوربەجورەکانی وەک پۆلێک هەنگ کەپێکەوە دەویزنێن دەکەوتنەویزەویزە ئینجا بێ وچان عەقرەبەکان بە توندیەکی بێ وینەهەڵ دە- سووران، بەچەشنیک کەئیتر عەقرەبەچکۆڵەکە لەعەقرەبە گەورەکەبۆکەس نەدەناسرانەوە چەند دەقیقە بەوجورە دەسووران ودوایی لەکار دەکەوتن، دیسان بەدڵێکی شکاو رێگەیدووکانی سەعات سازێکی دیکەم گرتەبەر .

کاکی سەعات سازم ئەوجارە ئاشنا دەهاتە پێش چاو شێوەم دەکرد ،بەڵام نەمدەناسیەوە زۆری لێ روانیم لەوکاتەدا کەسەعاتەکەی هەڵدەپچڕی و خەریک بوومەکینەکانی دابگرێ

کاکی سەعات سازم ناسیەوەو قیافەوسەروسەکوتیم وبیرهاتەوە زانیم کەجاران رانەندەی چەشنەشەمەنەفەرێکی بو- خاربووە وتەنانەت لەچەند سەفەر شۆفیری شەمەنەفەرەکەی من بووە هەر لەوکاتەوەبووکە سەعات ساز تەواوی ماکینەکانی سەعاتەکەمی لەبەریەک هێنا دەرو گوتی:

ـ ئەم سەعاتەی ئێوەزۆرهەڵم وبۆق دەکاودەبێ مەنفەز (دریچە) هەڵم وبۆقەکەی تۆزێک بەرەڵا بکەی لەم قسە ئەوەندە سەرم سوڕمابووکەوام دەزانی خەون دەبینم وئیتر باوەڕم نەدەکرد ئەوکابرایە هیندەگەوج بێ وشەمەنەفەرەکەی خۆی وسەعاتە هەناسە سار- دەکەی من وەک یەک ببینێ و... چیدی خۆم بۆ رانەگیراو چە ـ کوچێک کەهەوەڵ جارچوومە لای دیم هەرلەبەرچاو مابوو هەڵمگرت وتاتوانیم لەسەریم دا ... کاکی سەعات ساز لەژێر دەستمدا سارد بۆوە وعومری دا بەجەنابتان وخەرجی ماڵ و منداڵ ئەویش کەوتە سەرمن چەندساڵیش زندانیان بۆ، بریمەوە .

خوالە مامە (ویلیام)خۆش بێت هەمیشە دەیگوت:

ئەسپی چاک ئەسپێکە کەلە مەیدانی موسابقەدانەیبرد- بێتەوە وسەعاتی چاکیش سەعاتێکە کەدەستی سەعات سازی نەگەیشتبێتێ:

پیاوی چاک بوو ،ئەوەندەی گڵ لەسەر سینگی ئەوە ئەوندە عومری ئێوە درێژ بێ

# عەزیز سەیفی

ـ تکایە خۆت بناسێنە .

ـ من عەزیزسەیفی خەڵکی بۆکانم ساڵی ١٣٣٩لەدایک بووم . ئێستاش لەئێدارەی ئامووزش وپەروەرش لەئوموری تەربیەتیدا موعەللیمم .

ـ تێکوشانی هونەریت لە چ ساڵێکەوە دەست پێکردووە ؟ چ هانەیەک ، دنەی داوی ؟.

ساڵی ١٣٥٥بۆیەکەمجار سەنتوورێکم چاوپێکەوت کە شکابوو ،تەنیا چوارسیمی بەسەرەوەبوو خاوەنەکەی کاک جەماڵ باباحوسێنی بووکە خەڵکی مەهاباد بوو لەبۆکان موعەللیمبوو .

کاک جەماڵ سەنتووری لێدەدا . منیش هەرلەمنداڵی یەوە حەزم لەموسیقا بوو . لە مەدرەسە بەودەنگەنا خۆشەی خومەوە گۆرانیم دەگوت وبە میزتەپڵم لێدەدا . ئەوەهەموو ئیمکاناتی ئەوسەردەمی شاری بۆکان بوو .

سەنتووری کاک جەماڵ سەت هێندەی جاران هۆگری موسیقای کردم . سەنتوورەکەم نەبوو . ساڵێک رابرد ومن سەنتوورێکی دوازدە خەرەکم وەگیرخست جارجار دەچووم بۆلای کاک جەماڵ وسەنتوورەکەمکۆک دەکرد .

لەماڵێ بێ ئەوەرێنوێنی ئوسوولی بکرێم تەمرینم دەکرد . کاک جەماڵ چەند ئاهەنگێکی فێر کردبووم ئەوانم تەمرین دەکرد . وای ـ لێهات هەروا رەمەکی فێربووم ئەوجاردەبوو سەنتوورێک پەیدا بکەم دەنگی خۆشتربێ ساڵی ٥٨ چوومە تاران و سەنتوورێکم کڕی بەپێنجهەزار

تمەن .سالّی ٥٩ لەفەرهەنگ وهونەری ئەوزەمان دوومانگ دەرسی سەرەتایی مۆسیقام خوێند پاش ماوەیەک ئەویشم بۆ نەرەخسا ولەبەربێ پوولّی هاتمەدەر.

دوای ماوەیەک لەگەلّ کاک، رەسوولّ میرزا پوورکەدا نیشتوو ـی سەقزەئاشنا بووم کاک رەسوولّ لەبۆکان نۆتی فێر کردم. بۆخۆم زۆرئاهەنگم لێدەدا بەلّام نۆتەکەیم نەدەزانی بەلّام پاش ئەوە لە گەلّ کاک رەشیدفەیزنژاد ئاشنا بووم زۆرتەشویقی کردم بوونی مامۆستایەکی دلّسۆزی وەک ئەوپتری هۆگری مۆسیقا کردم.

ئەمجار سەنتوورەکەی خۆم بەکەیفێ نەبوو پێم خوش بوو سەنتووری دەنگ خۆشترم هەبێ ئەوسەنتوورەی لە تارانم هێنابوو هەلّم وەشاندتا بزانم چی تێدایە. ئەمهەلّوەشاندنە بووبەبناغەی سەنتوورساز، کردنی من وبۆهەوەلّ جارلە گەلّ کاک خالید رەشیدپوور، سەنتوورمان سازکردسالّی ٦٠و ٦١ دەست بەکاربووین وچەند سەنتوورمان سازکرد کەهەر خراب نەبوون دەنا لەو باشانەش نەبوون. ئەو سەنتوورانەی سازمان دەکردن یەک یەکم تاقی دەکردنەوە بەلّام دەنگی هیچکامیانم بەدلّ نەبوو. کاک خالید پاش ماوەیە لێم هەلّبڕا من بەتەنیا مامەوە.

هێندێکم دارگوێزپەیداکرد ودەستم کردەوەبەسەنتوورساز کردن. دوایێ چوومە تاران وکاری وەستای سەنتوورسازی وەک (ئازمی)، (عازمی)م دیت و لێیان وردبوومەوە. ئەم چاوپێکەوتنەو ئەزموونی پێشوومدەستیان دادەستی یەکدی وتوانیم سەنتووری باش سازبکەم. بۆهەوەلّ جار سالّی ٦٣و ٦٤ سەنتوورێکم بردەتاران بۆکانوونی چاووش سەیریان کردوزۆریان پێ باش بوو. لەوێ ئەویان لێ کڕیم.

دنەی مامۆستای وەک کامکار بووبەهۆی ئەوەپترحەول بدەم وبۆیەکەمجارسەنتوورێکی یەک تیکەم دروست کرد کە خوێندکارێکی هونەری لێی کڕیم وبردی بۆ دەرەوەی ولّات. تا ئەودەم ئێستا سەنتوورییەک تیکەسازنەکرابوو. هەم لەوانی پێشوو جوانتربوو هەم دەنگی خۆشتردەهات وهەم رەختەتربوو. مامۆستای وەک، رەزا رەزایی لەسنەو کامکار لەتاران پێیان وایە سەنتوورەکانی من خۆلە قەرەی سەنتووری ئازمی دەدەن.

ـ بەبڕوای تۆچ ئەنگیزەیەـک دەبێتە هۆی ئەوە تازە کارێک ببێتەحیرفەیی ووەستا.

ـ بەڕای من شەرتی بنەڕەتی ئەوەیە کەتازەکار، کاری خۆی پێشان بدا تاخاوەنڕاو چازان رای لەسەربدەن و رەخنەی لێ بگرن وئەویش لەو قسەوباسانە ئەزموون وەربگرێ وکەموکووڕی کارەکەی چاک بکاتەوە. من بۆخۆم وام کردووە.!

ـ تۆسەنتوورسازدەکەی. دەکرێ بلّێی لەچاو سەنتوور سازی دیکە چ ئیمکاناتێکت هەیە وچ کەم وکووڕی یەکت لەباری کەرەستەوەهەیە؟

تایەک دوومانگ لەمەوبەر ئەوکەرەستەی کارم پێدەکرد

ئەمانەتی بوو. وەسیلەی دۆست وبرادەران بوومن کارم پێدەکرد. بەڵام ئێستا وردەوردە بۆخۆم شتم کڕیوە وەک دارەگو ـ یزوسیم ومزراب.

ـ سەنتووربۆسازدەکەی؟

من ئاشقی سەنتوورم و مۆسیقا مخۆش دەوی. ئەمکارەشم بۆفرۆش نیە هەرچەندئیمکانی مادیم کەمە دوای ئەوەکە سەنتوورتەوا وەدەبێ مشتەری دەگاتەسەر هەرکەفرۆشتم وەک ئازیزێکم لەدەست دابێ پێم وایە! بەڵام ئاجوچارمنیە.

ـ بەبڕوای تۆ هونەری مۆسیقی چیەو چ تایبەتی یەکی هەیە؟.

ـ هەرکەس دەست لە سازدەدا دەبێ ئەنگیزەیەکی هەبێ. دەبێ ئەوەبزانن کە مۆسیقی تەفەننون نیە ،مۆسیقی جگەلەوەکە غەزای روحە پێشاندەری باروحالەتی دەروونی ئینسانیشە. بەیانی ئەوهەستەیەکە ئینسان لە پێشوودا تەجرەبەی کردووەو زمان برستی دەربڕینێ نیە یا پێی خۆشە بەشێوەیەکی دیکە رای بگەیەنێ ئەودەم دەوری مۆسیقی دێتەگۆڕونەخشی خۆی دەگێرێ.

ـ نەزەری خەڵک بەعام لەبارەی هونەروهونەرمەندەوە چیەودەبێ چۆن بێ؟

ـ هونەرمەندلەکوردستانی ئێراندالای خەڵک رێزێکی تایبەتی هەیە. هەرکات لە جێگەیەک خۆدەنوێنێ خەڵک دەستنیشانی دەکەن.قسەی ئەسڵی ئەوەیە کەئەگەرخەڵک هونەرمەند بناسن رێزی لێدەگرن بەڵام زۆرهونەرمەند نەناسراون یابۆخۆیان پێیان خۆشەنەناسرێن یا خۆدەرفەتی ناساندن نەرەخساوە.

بۆدوایین قسەدەڵێم :بەناوی لایەنگرێکی مۆسیقی دەبێ بڵێم تکالە، هونەرمەندان دەکەم کاری خۆیان بخەنەبەرچاوی‌سەرنجی خەڵک ، بالەلایەک کەموکووڕی ـ یەکانیان بۆ راست کەنەوەوبەرەخنەی بەجێ رێنوێنی یان بکەن ،لەلایەکی دیکە شەوە بیاننناسن کۆری هونەری پێک بێنن وبەدانانی نونێگەو....... خەڵک لەکاری هونەری خۆیان ئاگاداربکەن لەکۆتاییدا جێی خۆیەتی سپاسی گۆواری سروە بکەمکە ئەم دەرفەتەی بۆهونەرمەندان رەخساندووە کەهونەرمەندی کورد بناسن وهونەرمەندی کوردبناسێنن. خوائاگای لەهەموولایەکمان بێ.

# پەزو بزن

## تەرشداری

پەرویز جیهانی

هەروەک دەزانین کاری کورد **مەڕداری** و**تەرشداری** بووە وهەرئێستاش زۆربەیکوردەکان خەریکی ئەوکارەن. مەڕدارەکان فەرهەنگێکی تایبەتیان لەوبارەوە هەیە. دەمانەوێ ئەوەندەی لەدەستمان بێ وبزانین ناوونیشانی **مەڕو بزنەکان** لەدەورەی **بەرخ و کار** تا دەگاتەرادەی پیری، هەروەها رەنگەکانی بۆخوێنەرانی بەرێز بڵاو کەینەوە. دیارە ئەوە کاری کەسێک ودوان نیە، هەرچەند لەوکارەدا، شارەزاش بن وتەرشداریشیان کردبێ، ناتوانن تەواوی ناوونیشانەکانی **مەڕو بزن** ئەویش لەکوردیدا کەلەهەرنا**وچەیەک** بەگوێرەی زاراوە دەگۆڕێ، بێ کەم وکووڕی باس بکەن. جائەگەر کەمایەسیەک* لەم گوتارەدا هەبێ ئەوانەی دەزانن وشارەزان، کەم وکووڕیەکەی بۆئێمە بنێرن، منەتبارمان دەکەن.

**پەز یا مەڕ**

زۆربەی مەڕدارەکان بۆناسین وناساندنەوەی مەڕوبزنیان ئەوانە **داغ ودروشم** (درۆف) دەکەن. واتە هەرتەرشدارێک دروشم وداغی تایبەتی خۆیان هەیە کەلەسەر گوێیاسوورەتی مەڕوبزن دایدەنێن. دروشمیا درۆف ئەوەیەکە گوێیمەڕیا بزن بەجۆرێکی تایبەتی (هەر تەرشدارێک بەجۆرێک کەوەک هی هاوسێیان نەچێ) دەبڕن ونیشان دەکەن. داغیش ئەوەیە کە گوێ یاسوورەتی مەڕ بەنیشانەیەکیتایبەتی بۆناسین داغ دەکرێ.

بەڵام جگەلەوداغ ودروشمانە مەڕو بزن لە رووی رەنگ وچۆنەتی گوێ وشاخ **وخوری ومووش** دەناسرێن کەوا لێرەدا باسی دەکەین. هەڵبەت هێژای گوتنەوەیەکە هەرمەڕدارێک**پسپۆڕێکیان**یش هەیە کەمەڕوبزنی خۆیان لەهەر شوێنێک ببینن دەناسن، تەنانەت ئەگەر

داغ ودروشمیش نەکرابێ.

لەکوردەواریدا بەبێچووی **مەڕ** یا **پەز** (**بەرخ ، بەخ، بەرخک وبەرخۆلە**) دەڵێن. بەرخ هەتا شەش مانگی بەم ناوە دەناسرێ. ئەوجار پاش برینگی **بەرگن ولوایەکەی "کاوڕ"ی** پێدەڵێن. "کاوڕ"یش دیارە یا "**کاوڕەمێ**"یە یا **کاوڕەنێر**". تادەگاتە تەمەنی یەک ساڵی تەواو هەرکاوڕە، پاشان دەبێتە "**شەک**" شەکیش دیارە "**شەکەمێ**"و "شەکەنێر"ی هەیە بەشەکی مێ "**بەریندیر، بەردیر ، بەردیل و بەیندی**"ش دەڵێن. بەشەکی نێر "بەرندر" دەبێژن.

جارێ وایەکە" کاوڕەمێ"یەک دێتە **بەران** و ئاوس دەبێ، ئەوجار پێدەڵێن **کاوڕزا**"یا "**کاورزێ**".

مەڕ لەکوردستاندا بەتایبەتیکوردستانی ژووروو لەتەمەنی هەژدە مانگی ئامادەی بەرگرتنە،واتەوادەی بەران تێبەردانیەتی.

ماوەی ئاوسی وبارداری مەڕیش دروست پێنج مانگی تەواوە، بەوحیسابە مەڕ لە تەمەنی نیزیک بەدووساڵی دا دەزێ.

شەکەمێ یا بەردیر پاش تێپەڕینی دووساڵ لەتەمەنەکەی واتە لەهەوەڵین ساڵی زاندا بە "**بزاشتیر**" ناسراوە . پاشان تەمەنەکەی بە گوێرەی ساڵەکانی زان دەژمێردرێ. بۆ وێنە دەڵێن ئەو مێیە دوو بەرخی یا سێ بەرخی یا ..... بەرخی یە. هەڵبەت لەهەوەڵین ساڵی زان بەگشتی "**می**" یا "**مهی**" پێدەڵێن.

بەومێیەی کە**نەزۆک** بێ وبەرخی نەبێ "ئەستێور" یا " ئستەور"ی پێ دەگوترێ.

ئەوجار بچینەسەرناوی **پەزی نێر**، گوتمان کەبەشەکی نێر "بەرندر"یشدەبێژن مەڕدارەکان لەنیوەی وەرزی هاوین کەمەڕەکان باش قەڵەووکۆک بوونەوە، هەرکەس بەگوێرەی دەستوەهات ورادەی مەڕی خۆی چەند شەکەنێری جوان وقەڵەو وسەرلاق هەڵدەبژێرن بۆ"**بەران**" بەران ئەو پەزەیە کەبۆ توۆف(تۆو) هەڵدە-بژێرێ. بەڵام مەڕدار بۆ پترقەڵەوبوونی شەکی دیکە ئەوانەدەخەسێنن. بەشەکی خەسا "**بەرانخەس**" یا "**خەساو**"دەڵێن. بەران خەس یا بەران لەتەمەنی سێ ساڵی دا دەبێتە "هۆگچ". کە "**بەرانی قەرت**" یا "**خەرت**" یشێ

پێدەڵێن. پەزی نێر پاش هۆگچی دەبێتە "**ماز**"، "ماز"پاش لەساڵێک دەبێتە "**دڕماز**"و پاشان "**دڕی دڕماز**"پێدەڵێن.

ئەوانە هێندێک ناوی مەڕ لەزمانی کوردیدابوو، ئێستا بەوکەموکووڕیەوە بچینە سەرباسی بزن وبزانین ئەوئاژەڵە خاوەنی چەند ناوە وچاوا دەناسرێ.

**بزن**

لەکوردەواریدا هەرمەڕدارێک بێگوتن چەندبزنیش بەخێو دەکا. بەخێوکردنی بزنیش بەستەبەجێگای ژیانیەتی. واتە مەڕدارەکان بەگوێرەی لەوەڕگە وزۆزان وئارانیان مەڕ و بزن بەخێودەکەن. بزن لەلەوەڕگەی چڕو سەخت وزانگ وبەرد دا زۆرباش قەڵەودەبێ

چون لەمەڕسووکترە ، دەتوانێ لەجێ رەوەزوراز وکێوی ئەستەمدا باشتر بچەرێ وهاتوچۆبکا . بۆیە هێندێک مەڕدار بە گوێرەی لەوەرگەکەی هەرتەنیا بزن یامەڕ خودان دەکەن . بەلام هیچ **کەرتەمەڕ و کەری یەک ( مێگەلێک )** بێ بزن بە تایبەتی **بێ نێری** نابێ چون **نێری** پێشەنگی مێگەلە و هەمیشە بەدەنگی بلوێرو شمشالی شوان یا بەفیتەی لێوی شوان لەپێش مێگەل وکەری دەڕوا وجلەو-کێشی مێگەلە .

لەزمانی کوردی دا بەبێچووی بزن، (**کار کهار ، کارک ، کاریلەو کارژیلە**) دەلێن بێچووی بزن تاتەمەنی شەش مانگی هەر"کار"ە پاشان تایەکسالی "**گیسک**"ی پێدەلێن گیسکیش، **گیسکەمێ و گیسکەنێری** هەیە . ئەگەر گیسکە-مێیەک بەگیسکی بزێ "**گیسکەزا**"ی پێدەلێن بزنیش وەک "مێ" لەتەمەنی دووسالیدا دەزێ ودەورانی ئاوس بوونیش وەک مەڕپێنجمانگە بزن لەهەوەلین سالی زان واتە لەسەرەتای سێ سالی دا بە "**تشتوور**" یا "**تویشتیر**" دەناسرێ . پاش لەتویشتیری هەربزنی پێدەلێن بەلام گیسکەنێر کەپێی نایەتەمەنی دووسالی " کوور"ە ، لەتەمەنی سێ سالیش دا نێری یە .نێری هەروەک گوتمان جلەوکێشی مێگەل وکەری‌یە وهیچ مێگەل وکەری‌یەک ، بێ نێری نابێ .

لەنێومێگەل دامەر وبزنی "**نەبان**" یش هەن. نەبان بەومەڕ وبزنانە دەلێن کە بێچووی خۆیان ناوێن ونایهێلن بیمژن . هەگەروهۆی نەبان بوونی بزن ومەڕ ئەوەیە کەلەکاتی زان دا ژانی زۆر دەبینن وناڕاحەتی زۆردەکێشن. زوربەی مەڕوبزنەکانی نەبان بزاشتیرو تشتوورن واتە مەڕوبزن زوربەیان لەهەوەلین سالی زان دا نەبان دەبن. لەنێو پسپۆران داکەسانێ هەن کە " **بانۆک**"یا "**بانەر**"ی پێدەلێن، کەکاریان بانینی مێ و بزنی نەبانە . بەپێچەوانەلەنێومێگەل دا مێ وبزنی واهەن، کەجگەلەبێچووی خۆی لە بەرخ وکاری دیکەش دەبانن کەبەوجۆرە مەڕو بزنانەش "**فیزەک**"یا" **سەردەبان** "دەلێن .

بەئەو مێ وبزنانەی کەبەرخ وکاریان دەمرن وبێ بێچوو دەمێنن"**هاوشینگ**"دەلێن ئەوجۆرە مێ وبزنانە بەبەرخ وکاری **بێ ماک** واتە بێ دایک یابەرخ وکاری **جمک** یا ئەو بەرخ وکاری کەدایکیان تێریان ناکەن دەمێژدرێن.بەبەرخ وکاری کە هاوشینگ دەمژن **مێشکە** یا **مێژۆکە**دەگوترێ .

لەنێو مێگەل دا بڕێک مێ وبزنی واهەن کەبەقاچاغی بەردەگرن وپێش لەوادەی زانی وێکرایی مێگەل دەزێن ،بەوجۆرە مێ وبزنانە "**بیژەک**" دەلێن، بەبێچووی ئەوجۆرە مێ و بزنانەش " **فراژوو** " یا "حلی" دەگوترێ ، بەلام بەپێچەوانە بڕێک مەڕوبزنیش دەرەنگ تر لە هەموو مێ وبزن بەردەگرن ودەرەنگ تریش دەزێن بێچووی ئەو ئاژەلانە"**ساوا**" یا "**قرنی**"یە .

**دریژەی هەیە**

# ..تابلۆی ژمارە ٤..

جەلال قادر

. لە بیرکردنەیەکی قووڵدا لە نێو دەریایەکی بێ سنوور هەر دوو دەستەکانی لە سەوڵی* بەلەمەکە گیر کردبوو و لەگەڵ شەقە کردنی ئاوەکە تەکانی دەدا . چاوەکانی حەشامەتی پێش دەرگای هۆڵەکەی بە ئاوازێکی نوێ دادەنا . دیارە هەموو بۆ سەیر کردنی تابلۆکانم هاتوون ،تابلۆکانم ڕەنگی هەورە کۆچەرەکانن، پایزە، بارانن کێڵگەکان پاراو دەکەن . زیندوون لە ژێر سێبەری مردوان دانانیشن . بە تایبەت تابلۆی ژمارە ٤، گەڵای سەوزی بەهارە، بۆنی گوڵی تەمەن درێژە، ئای تابلۆی عەزیزم! چەندم خۆش دەوێی، خۆزگە ڕەنگێ بام دەگەڵ تۆ. چوار چێوەیەک بام شێوەی دیمەنتم ڕازاندباوە.

دەگەڵ گەیشتنی خان پەردە لەرووی ڕاستی هەڵدە درێتەوە. ئەو خانە گەورەترین سەرمایەدارە و خاوەنی چەندین کارخانەیە. دەبێ کەی بێت و پەتی کرانەوەی پێشانگاکە ببڕێت ؟!

لەو بیر کردنەویە دابوو خان گەیشتێ. هەر دەگەڵ پسانی پەتەکە، چەپڵە لێدان و هەلهەلە دەستی پێکرد. دەتگوت بووکیان هێناوە و زاواش تارای بەسەر دادەدا . هێندێک لە خەڵک بۆ شیرینی خواردن هاتوون و هێندێکی تر بۆ ناودەر کردن و خۆ ناساندن بەخان.

نیگارکێش وەپێش خان کەوت و یەکە یەکە تابلۆکانی بۆ ڕوون دەکردەوە.

خانیش سەری دەلەقاند و تەنیا دەیگوت جوانە! لەو کاتەدا نیگارکێش خەریک بوو لە پێستی خۆی بێتە دەر خانی بە گێل دەزانی چونکە زۆری باسی تابلۆی ژمارە ٤ بۆ کرد بەڵام ئەو گوتی ئافەرین. ڕەنگی جوانت تێدا بە کار هێناوە .

وزەی لەلەشدا نەما . مۆڕەی لە خەڵکەکە دەکرد هەموو تەنیا لە بەر خان هاتوون هیچ کەس بۆ دیتنی پێشانگاکەی نەهاتووە. یانی ئەو هەموو هیلاکییە و شەو نخوونییەی دەکردەوە. بۆ دەبێ بیر کردنەوەکانی دوێنێ ئەوڕۆ ئەفسانە بن؟

چوونە دەری خەڵک لە پێشانگاکە شریتی خەیاڵەکانی پچڕاند. پاشان ڕوانیە دەفتەری "تێ بینی" کە بە کراوەیی داندرابوو. کەس دەستی بۆ پێنووسەکەی نێو دەفتەرەکە نەدەبرد. ئاوڕێکی داوە دیتی لە قوژبنی پێشانگاکە "خان" خەڵکێکی زۆری لێ ئالاوە سەری سوڕما! گوتی: ڕەنگە سەر لە

تابلۆیەک دەرنەکەن بۆیە وا کۆ بوونەتەوە. بۆ لای وان هەنگاوی هەڵێنا کە لێیان نیزیک بۆوە بینی (دیتی) باسی بازرگانی و چۆنیەتی جوانی نەخشەی خانوو دەکەن. کەس ئاوڕی لێ نەداوە. تووڕەییەکەی گەیشتبۆ ئەوپەڕی خۆی. دەیویست تابلۆکان بشکێنێ ... نا ... نابە سەریان دادا!

خان بە دەنگێکی بەرز بانگی کرد و گوتی: تابلۆی ژمارە ۴ بۆ من دانێ.

. نیگارکێش هەڵوێستێکی گرت و پاشان وەڵامی داوە:

بۆ تۆ دەست نادا!

خان: بە بەرزترین نرخ دەیکڕم.

نیگارکێش: بە هونەرەکەم بازرگانی ناکەم! خان تووڕە بوو و وەک تەماتە سوور هەڵگەڕا. خەڵکەکە قسەی ناشیرینیان بە نیگارکێش گوت. چۆن دەتوانی خان تووڕە کەی؟ خەڵک هەر بە دیاری تابلۆی پێشکەش دەکا.

نیگارکێش: ببوورن، خان بە تەواوی لە تابلۆکە نەگەیشتووە!

خان چاوی چۆ پشت سەری و زیاتر تووڕە بوو و دەستی کەوتە لەرزین.

خەڵکەکە گوتیان: چۆن بە خان وادەڵێی ئاگات لە قسەکانی خۆت بێ.

نیگارکێش ئەو رق و قینەی کە چەند ساڵ بوو لە سینگی داپەنگی خواردبۆوە. دەگەڵ هەناسە دانەوەی هاتە دەر و گوتی نەک "خان" ئێوەش سەر لە تابلۆکانم دەر ناکەن!!

خان هاتە پێشو دەستی لە یەخەی نیگارکێشەکە گیر کردو گوتی:

لە مەو دوا نابێ پێشانگا لەو شارە بکەیەوە. ئێرەش لە ئێستاوە داخراوە. بەپەلە تابلۆ ژەنگاویەکانت کۆ کەوەو بڕۆ. خان ڕۆیشت و خەڵکەکە وەدوای کەوتن

نیگارکێشەکە لەگەڵ دەرهێنانی بزمارەکان. لە ژێر لێوانەوە دەگەڵ تابلۆکانی دەدوا. پێشانگا ـ یەکەش وەک مانگە شەو رەنگی تاریک و روونی دەمەو بەیانی بە خۆوە گرت.

# ڕێنوێنی ئەدەبی

نەغەدە: **کاک محەممەدی ڕەحمانی**.

نێوەرۆکی شیعرەکەت کە بریتی یە لە شەڕەدندووکەی ژن ومێرد زۆر جوانە. بەداخەوە شیعرەکانت لە باری وەزن و قافیەوە زۆریان کەموکووڕی هەیە. ئەگەر بۆمان بلوێ چاکیان دەکەین و شیعرەکانت بڵاو دەکەینەوە..

مەهاباد: **کاک عەلی موڕڕەبی**

شیعرەکانت هیندێکیان جوانن وهیندێکیان لەباری وەزن وقافیەوە ناڕێکن. بەڵام دیارە زەوقی شیعر گوتنت هەیە وبەتێکۆشان سەردەکەوی.

ئەوەش نموونەیەک لە شیعرەکانت کە جوانن.

دەمرم هیچم دەس ناکەوێ
قەبر تۆچیت لەمن دەوێ
بەئاوات بووم ڕۆژو شەوێ
ئەو مامەپیرە سەر کەوێ

* * *

پێی گوت بولبول گەلێ زۆرن
بولبولی ئەحمەدی کۆرن
ئەحمەدی کۆریش سەدجۆرن
خدرخۆیان لێ دەگۆڕن(؟)

* * *

ئەو شیعرانەکەشکی سواون
قڵفە ،قڵفەن،پاکی داون
کاکی خۆم چاکیان بجاون
من ڕۆیشتم ئێوەش ماون

مەهاباد: **کاک فەرهاد جەهان میهەن**

نوسیوتە ئەگەر کەسێک شیعر و نووسراوەی بۆچاپ نابێ پێویست ناکا ناوی لە بەشی ئێمە وخوێنەردا بنووسن. ئێمە هەروا بە ئاسانی دەست لەلایەنگرانی خۆشەویستمان هەڵناگرین چونکە دەزانین نووسەران و شاعیرانی داهاتوومان هەر ئەوانەن کە ئەوڕۆ شیعرو نووسراوەیان کزە و بۆ چاپ نابێ. شیعرەکانی تۆش نیشان دەدا کەزەوقی شیعرت هەیە ولەداهاتوودا دەبیە شاعیر.

ئەوەش نموونەیەک لە شیعرەکانت:

چرای شەوگارم بەکزی
ئەستێرەیەکی تەنیایە
لەئاسمانی ڕەش وتاردا
بەئاستەم شەوق ئەداتەوە
شەوە،شەوێکی سارد وسڕ
شەوێکی دڵ پڕلە ئاوات
چ ئاوات وچ نیازێک؟

مەهاباد: **کاک کەماڵ کۆکەبی**.

گلەییمان لێ مەکە.

---

**فۆرمی ئابوونمان**

**شمارە**

**ناو..........شۆرەت............ نیشتووی............**

**.......تمەنم بەحیسابی ژمارە ۵۴۰۰ ی شوعبەی ناوەندی بانکی سپەی ورمێ گرت و فیشەکەم وتێرای ئەم بەرگە بۆ ئادرن. لەژمارە.......را هەتا.......گۆواری سروەم. بۆ بەرێ بکەن.**

**ناونیشان............**

..............................

ئێمە لایەنگرانی سروە
هەموویانمان لە چاومان
خۆشتر دەوێ.داوای رەخنەی
ئەدەبیت لێکردووین .ئەوە
شیعری تۆ ئەوەش بیرورای،
ئێمە :

من کەوا لەو شارەویلێم
لەغەموپەژارەدا بێ گومان
لێلم

بۆخۆت دەبینی کە
میسرەعی دووەم زۆر لە
میسرەعی یەکەم درێژترە و
وەزنیشیان گۆڕاوە .

لەناو باخی دلم غەم
داسەپاوە
هەروەک قوڕ لەقوڕکێش
خزاوە

دیسان میسرەعەکان وەک.
یەک نین وئەوجار لیباسی
تەسک وناسکی شیعرت لەبەر
قوڕ و قوڕکێش کردووە.جا
خۆت بزانە چی بەسەر هاتووە!
باقی شیعرەکانیشت هەر
ئاوان .

**سەردەشت گوندی نەلاس: کاک محەممەدی فازیلی :**

تکایە وەک نووسیوتە
بەسەرهاتی فەقێ یان بنێرە
تا ئەگەر چاک بوو بلاوی
کەینەوە. ئەوەش ئەو دوو
شیعرەی بۆت ناردووین وزۆر
جوانن .دیارە شاعیری چاکی
ودەتوانی شیعرمان بۆبنێری.

غەم رەفیقمە مالی ئاوا
چونکە زوو،زوو سەرئەدات
شادمانی مالی وێران
ئەو بەمیهمانیش نەهات

**مەریوان :کاک عوسمان محەممەد عوسمان .**

شیعرەکانت زۆر جوانە.
تەنیا دووسی یەکیان نەبێ
ئەوەش ئەوانەی کە ئێمە
پێمان جوانن .

ئەنێرم بۆ ئەو سروەیە
سلاوم
لەگەل شووشەی پڕلەعەتر
وگولاوم
خۆمدەناسێنم بەشیعری کەم
وکووڕ
بەئاراستەی فکروهۆشی
بلاوم
زۆرئامادەم ئەگەر لاتان
پەسندبێ
کەبی نێرمشیعروپەخشانی
خاوم
هونەر کەشتی وهونەر
دۆستان کەشتیوان
خامەسەولە لەبەحری پڕلە
ئاوم
سروە جێگەی شانازی
هەموومانە
لەگزینگ وپرشنگی سەر
سوڕماوم
ئەشکی چاوم لەسەرگۆنام رژاوە
لێمەپرسە لەسەر چیە
گریاوم
ئاوارەی دەستی سەددامی
کافرم
عێراقیم ولەجێی خۆم
هەلگەنراوم

**تەورێز :زانستگای تەورێز: کاک کەمال لەتیفی :**

نامەکەت کە بە شیعر
بۆ- ناردبووین کەیشت
لەنامەکەت دا هاتووە:

"هیوادارم کەقەبوولی کەن
لێم
چونکە نووسیومەبەدل وبە
گیان
شیعر دەنێرم مەقالە و
هەلبەست
جارێک وپێک بێ یاخوار و
لاپان
لەچاپی بدەن کەنرخێکی
بوو
دەنا چاوەرێمبۆرێنسوێنی
- تان
هەر چاوەرێتم سروەی
خۆشەویست
یاخوا بەخێربێی بینایی
چاوان
تەنیا دلخۆشی من لە دوور
ولات
هاودەمی تۆیە بووژێنەری
گیان

زەوقی شیعرت هەیە
و ئەم شیعرانە شاهیدی
ئەوەن کە دەتوانی شیعر
بلێی. لەشیعری "دۆستی
گیانی"دا شیعرەکانت
وەزنیان جاروبار تێکچووە
وەک ئەو دوو شیعرە:

ئەی ساحێبی سڕ بزانە
رازت تۆمارناکرێ
گەرئەتۆخوت باسی نەکەی
کەس ئاگادارناکرێ
دوستهەتا زۆربێ کەمە
ئەمما بزانەمەیلەکەت
کامەیانی گرتووە کامی
بۆباشار ناکرێ

# شاعیرانی لاو

## دیوارەکان

محمد ئەحمەد دیالی

دیوارەکان
بە خۆفی وەک ماڵی دێوی
قەلای رووخا و چەند دزێوی
لە لای ژووری زێدی ئێمە
گەلێک دیواری کۆن دیارن
وەکو دەمی گزیری پیر
ریچ وگیرو چەون و خوارن
دەمێک ساڵە تێک قرماوە
بەلام ئێستا بە تەواوی
بۆ تەواو بوون نەرووخاوە
خاک و خۆڵ و بەردو داری
کە کەڵەک بوون بە بێگاری
بە شان و بە هۆی هەژاران
چنرا سەریەک بۆ زۆرداران
تابیتە کار دژی خۆیان
هەلپسێنێ تان وپۆیان
کۆشک و قەلاو نیشتە جێگەی
غولامی ئەلقە بە گوێکەی
کوێخا ، نۆکەر ، گزیری پیر
تاژی وان بوون لە بۆ نێچیر
جەوری قەلای سام و بەلا
وەکو لافاو وەکو ئاگر
بێ ئامان و دنیا داگر
چون هەژاریان بە دەردی برد
چی یان نەکرد چی یان نەبرد؟
چەوساندنیان رەتاندنیان
بە گۆشت و پێست کراندنیان
چینی وەرزێر چینی جووتیر
تەنیا لە بەرهەمی ژیان
ئەوە برا بوو بە بەژنیان
بێگار و تیلان و برۆ
ماندووی رەنجێکی رەنجەرۆ
داخو بلێی ئەم زامینە
کە لە ناخی لەشی ژینە
ساریژ بێت و خۆش بێتەوە
دیسان ئەمجاریش سەر لە نوێ
ناسۆر نەبێ و نەکولێتەوە؟
ئەو دیوارانەی ژوور دیوە
ئێستاش دەنگی بێگار دەدەن
خەلکی لە بەردو دار دەدەن
هەر بەردێکی دیوارێکی
هەر قسپێکی پاسارێکی
هەر کام لە عاست خۆیانەوە
ئەم روژگارە لێ برانەوە
گورزێکن و گۆپالێکن
بۆ یەک مەبەست و خاڵێکن
گریزێکن کوێخایەکن
قەلایەکن ئاغایەکن
هەر کام میرێک و خانێکن
هەموویان لەشی گیانێکن
دادەخورن ریچەیانە
خیسە دەکەن بۆ بەهانە
شەوە زەنگی کۆیلەت باری
روون بوو بە تیشکی رزگاری
قەلشی دەستیان پڕ بوونەوە
بەرە و سەرەتا چوونەوە
بەلام ئەی چینی داچزاو
ئەی بەجەوری قەلا رووخاو
بەخوا تاکوو ئەسەواری
ئەم دیوارە هەروادیارە
لەسەر لەشی داچزاوی ژین
لەشی پڕلە زام وبرین
لەسەر لەش ئەو تاروپۆیە
هەر بەسۆیە هەر بەسۆیە
نازانم تاکەی دەمێنن
هەر دزێوی خۆ دەنوێنن
دەزانم مات و دلپڕن
چی دەکەی ئێستا بی گور ن

شەوگاری من
لە سەدەفی بەتاڵ ئەچی
لەو رۆژەوە
لە من تۆرای
لەو رۆژەوە
تۆی مرواری
بوویە لزگە
لە گەردنی نامۆ
ئالای

# پاییز... ئەی پاییز

م.خالیدی

دەروێشی هەژار
کەشکۆڵی لەکۆڵ
بێ ڕێگا وئامانج
دەبڕی شاخ ودۆڵ
بۆ پشوو ساتێک
لەبن بەردێکا
دەستی بۆ ئاسمان
خۆی لەخاک وخۆڵ
دەی وت :
ئەی پاییز
ئەی پاییز مەیە
گەر ئەمجارە دێی
چرنووکی مەرگت مەگرە لەدیمەن
دامەڕووشێنە ڕوومەتی چیمەن
ناڵەی بولبولم لێ مەتاکێنە
بزەی گوڵانم لێ مەژاکێنە
گەر ئەمجارە دێی
بێ زریان وەرە
بێ ڕووتەنی دار ،بێ هەوری ماتەم
بێ گریان وەرە ،

پاییز بزانە
ڕێبواری ماندووم
شینکەی بەهار وگەرمایی هاوین
زەردایی پاییز
لە گیانم دەسووم
پاییز من برسیم
ڕووتم هەژارم
لە کەشکۆڵی کۆڵ
لەباتی نان وپێخۆرو بژیو
خەم بۆتە بارم
دەسا گەر تۆ دێی
نانم بۆ بێنە
بۆ کەلاوەی ژین
بانم بۆ بێنە.
با سفرەی ماڵم
ئاوا چۆڵ نەبێ
هاودەمی ژینم
خاک وخۆڵ نەبێ
کەزستانی سارد لەڕێگاوە بێ
لە لای تۆش دەڕۆم
ئەمجارە دەبێ لەمۆسیقای سارد
لە سەمای بەفرا
خەم و خەم بخۆم.
پاییز تۆ مەیە
با نەیا زستان

# هاواری دێو

جەمیل کەریمی

دێوی ترس لە ماڵی ئێمەدا هەمێشە نیوەخەوە. بە بچووکترین جووڵەی بیری ئێمە تێک رادەبۆ و ماڵەکە دەشێوێنێ هەگەری* ئەم ترسە زۆرە لە دەروونی ئێمە دایە. دەنا لە دنیادا کەم شت ترس خوڵقێنن .

بە منداڵی شەوانە دەنگێ دەهات وای دەچریکاند مووی لەشم لێ دەبوو بە نەشتەر. دایکم لە ئامێزی وەردێنام و بە خۆیەوە دەکوشیم و وێڕای من دەلەرزی. جارجار بە پارێز سەرم هەڵدێنا و زەینی دایکم دەدا ڕەنگی بە رووەوە نەمابوو و فرمێسکی چاوی دەبریسکاوە. بەدیتنی ئەم دیمەنە درنجی* ترس لە خەیاڵمدا سەت هێندە گەورەو دزێو دەبوو.

باری ژیانم رای دەکردو کانی رۆندکم* دەچکی،دەبوومە لەشێکی بێ گیان. لەسەرەخۆ دەچووم و بەدەم ترس و لەرزەوە خەو دەیبردمەوە.

خەڵکی شار هەمووگیرۆدەی ئەم بەڵایە بوون و کەس دەرگای دڵی لەسەر ترس گاڵە نەدەدا. گەورە و بچووک ئەم دێوە دزێوەیان لەباوەش دەگرت و جار لە جارێ پتر لێی دەتۆقین. هەموو کە لە*زراو ببوون و شەوچەرەی شەونشینییان شەونخوونی وهاواری نەترە بەر وباسی دێو و درنج و مردن و بەڵا بوو.لەشکری ترس، وەخۆ کەوتبوو وئێمەش لەترسان یارمەتیمان دەداو هێندەی دیکە ترس هێنترمان دەکرد و زراومان لێی دەچوو.

یەک دەیگوت : نەڕەی گیانبەرێکە هەر شەوە گوناهبارێک راو دەکا وبۆ قەبرانی ڕەکێش دەکا .

ئەویدی دەیگوت :هاواری مردووی خراپە کەجەزرەبەی دەدەن وبیستنی جۆربزەی دەوی .

هێندێک دەیانگوت :گۆوەندی شەیتانە ودیلانی شێتانە و وەبای پێوەیە .

هەرکەسە بەیتێکی بۆ هەڵدەبەست کەلەوانی دیکە سەیرتر بوو. سەیر ئەوە بوو کەس رووداوەکەی بەچاو نەدیبوو. یەک لە یەکی بیستبوو. وەک ڕەوە مەڕ کە هەرچی نێری بەلەزتر بۆ مەڕەکان پتر بە دوویدا ڕادەکەن. جا هەرچی پتر ترسابوو قسەکانی بەسامتر بوون. کەس لە هەگەری ترس نەدەگەڕا و تەنیا لە دیمەنی ترساوەکانیان دەڕوانی .

ڕوژیک لەگەڵ بابم چووینە ماڵێ مامم . لە گەڕانەوەدا ئەم دەنگە بەرز بۆوە.لە بەرەبانی تاریک و بەسامی بازاڕ وەک قاویزەرندەی نێو غار بەخۆف و نەترەبەر بوو .

ورەم لە گیان و گیانم لە لەشدا نەمابوو. خۆم لە پشت بابم مەڵاس دا .

دوو دۆستی بابم منیان خستە ناو بەندی خۆیان و هەژدەر هەژدەر* لە ترسان قسەیان دەکرد تا بەڵکوو ئەم کەڵە دەنگە کەمتر ببیسم. هەرچی هەنگاومان

هەڵدەبڕی و بەرەوپێش
دەچووین دەنگەکە نزیکتر
دەبۆوە وسەیر ئەوە بوو
کە ئەوەندەی دەنگ نزیک
دەبۆوە ئەوەندەش ترس و
خۆفەکەی کەمتر دەبوو.
گەیشتینە جێگایەک کە
ئێستاش بەماڵێ ئەمیر
دەناسرێ بابم پوولێکی دا
بە دالان دارەکە و بەڕێی

یا هێرشت بۆ دێنن؟
بۆوا دەگوڕێنێ؟
بزەیەکی هاتێ.چاوێکی
لە جلکی تیتۆڵ تیتۆڵی
کرد وهەناسەیەکی هەڵکێشا و
گوتی :
— بابەکەم! من کۆڵگری
بازارم. داهاتەکەم بەشی
خەرجەکەم ناکا.پشتم دێشی
و وەک جارانم کار پێ ناکوێ

فیلەتەری* رەشم کوشتبێ
بام وەبن هەنگڵ درا و
بایی بووم وهاتمەوە ماڵ
و هەمووم لە خۆ کۆ
کردنەوە و رووداوەکەم بۆ
گێڕانەوە. بەڵام کەس بڕوای
نەدەکرد.
گوتم :
— بابە تەماشا ئەوانە
باوەڕم پێناکەن !

کرد. هێندەی پێ نەچوو
دالاندار هاتەوەو کۆڵگرێکی
لەگەڵ بوو.باوکم گوتی :
— رۆڵە ئەم دێوودرنجەی
لێی دەترسێی و زەندەقی
بردووی ئەم پیاوەیە. وەک
تۆ ئینسانە! ئەدی بۆ
ئێستا لێی ناترسێ؟ ها؟
— جا چوزانم.
رووم لەکابرا کردوگوتم:
— مامەگیان جندووکەو
شایەتینی* ئەوکت دەکوشن ؟

بۆیە شەوانە تا بەیانی
لەسەربانی قەیسەری هاوار
دەکەم و دەناڵێنم تا دز
نەیە وبزانم من وەخەبەرم.
خاوەنی دووکانەکانیش هەر
یەکە چوار قرانم دەدەنێ
هەم من بژیوێک پەیدا
دەکەم وهەم ماڵێ وانیش
پارێزراوە. خوا لێیان
بەزیاد کا.
وەک ئەوە دێوێکی

دایکم گوتی :
— کوڕم من دەنگی دێو
و درنجم لەگەڵ دەنگی
کۆڵگر وحەشاس* لێ تێک
ناچێ......
باوکم گوتی :
— کوڕم.خۆ سەخڵەت
مەکە ! ئەم داد وهاوارە
بێ فایدەیە.گەلێک کەس
پێیان خۆشە بترسن وو
خەڵکیش بترسێنن .

## بەرەو زمانی یەکگرتوو

مەدفێ ل ڤێ گوتارێ دا مێژوویا رێنڤیسا کوردی بجورەکی سەرایی وسادە حەتا جیهێ کوئاگاداریا مەهەبە ژوە خوونەرێد خۆشدڤی وهێژا راشرۆڤەکەن وپاشێ چاوانییا ئەلف بێتکێ کوردی ورێنڤیسا ئیرۆیینە زمانێ کوردی بوهەوە خوونەرێدهێژا بدەنەدیارکرن. هەلبەت پێدڤی یی گوتنێ یە کوئەڤ گوتارا بۆئاگاداری یا وەعەزیزایە وهوون دشێن هەرجورە رەخنەوقیلەلێ گرتن و پێشنیارێ خۆل باراڤێ گوتارێ ودیترپشکێدڤێ گۆڤارێ دا بۆمەبهنێرن.

رێنڤیسا ئەزمانێ کوردی ژی وەکی ڤی گەلی لدرێژا یا مێژوویێدا گەلەک ئەڤراز ونشیڤ وزۆرئاستەنگ و گەلی رابهۆرتییە وحەتا گەهیشتییە ڤێ چاوانی یێ. سەرنڤیسینا مێژوونڤیسەکی کورد، کوردان پێشتا وەکی فارسان پێ پیتێ مسماری دنڤیسین، ئەمما پاشێ یانیدەهەسەدەیاپێش لدایک بوونا مەسیح ئەلف بێتکەکی کوردی بناڤێ ئەلف بێتکێ **ماسی سۆراتی** ل ناڤ کوردان دا بوو دەب. ئەڤ ئەلف بێتکا مێژڤەترین ئەلف بێتکێ تایبەتە کوردی بوویە. ئەلف-بێتکی "ماسی سۆراتی" ٣٧ پیت بوونە کو ئالی یێ دەستێ راستێ دا دهاتن نڤیسین و بەرب ئالی یێ دەستێ چەپێ دچوون. ئەڤ ئەلف بێتکا حەتا سەرکەتنا دینێ پیروزە ئیسلامێ ل کوردستانێدا بکار دچوو. نموونا پیتێ ماسی-سۆراتیێ دگەل دیتر ئەلف بێتکێد کو حەتا نهەکوردان بکاربرنە ل کوتایا ڤێ گوتارێ دا هاتییە نتلاندن.

ئەمما بلی ئەلف بێتکێ "ماسی سۆراتی" ئەلف بێتکەکی دی یەمێژوویی وتایبەتی ژی ل ناڤ کوردان دا دەب بوویە. ئەوژی ئەلف بێتکێ تایبەتە کوردێد ئێزدی بوویە. سەر نڤیسینا پرۆفیسور قاناتێ کوردۆکول گوڤارا کۆڕی زانیاری کورد بەرگا یێکێدا بەلاو بوویە، ئەلف بێتکێ ئیزدی یان ٣٣ پیت بوونەو ل ئالی یێ راستێ بۆلایێ چەپێ دهاتن نڤیسینێ. قاناتێ کوردۆ، دنڤیسە کودیارنینە ئەڤ ئەلف-بێتکا کەنگێ رال ناڤ ئێزدی-یاندابوویەدەب. ئەمما دنڤیسە کوئەڤ ئەلف بێتکا ل بەردەنگ وئاوایێ ئەلف-بێتکێ عەرەبی هاتنەسەراست کرنێ.

دگەل سەرکەتنا دینێ پیرۆزە ئیسلامێ ل کوردستانێ دا کوردان ژی وەکی موسلمانان گژکێ ئەلف بێتکێ خویە تایبەت ژبیرکرنەوپێ ئەلف-بێتکێ عەرەبی نڤیسا رێدخو نڤیسینە. رێنڤیسا عەرەبی ژی ل ناڤ کوردان دا حەتا ژێک بەلاوبوونا پادشاهی یا عوسمانی وسەراست بوونا رژیما کۆماری ل تورکیایێ دا هەربەردەوام بوویە.

ئەمما پاشی هاتنەسەر شۆلێ یا ئاتاتورک وگوهۆرینا رێنڤیسا تورکی ژعەرەبی بۆ لاتینی، گوهۆرین کەتە ناڤ ئەلف بێتکێ کوردێ ژی کوردێد کوردستانا تورکیایێ هەرچەند کوخاندن ونڤیسین هەیلۆ ئاخفتن وقسەکرن ب زمانێ زک ماکی ژوان راباساغەوهاتییەقەدەغە کرن. ئەمما ئەگەر خاندن ونڤیسینەک وانە دزیڤا ژی هەبە، ب ئەلف بێتکێ لاتینی یە. ل دیترپشکێد کوردستانێ دا ژی ئەگەر کوردی نڤسینەک هەبە ب رێنڤیس وئەلف بێتکێ رەسمییە دەولەتێدسەردەستە.

باساخەبەرێ کوردێد ئەرمەنستانا ئوورساتێ ژ ئەلف بێتکێ ئوورسی وێجێ ڤەردگرن ، کوردێدسووریێ ژی هە ئەلف بێتکێعەرەبی بکار دەبن . حەتانی پاشی شۆڕشا تەموزێ لعێراقێ داکوردێد وێ دەرێ گوهۆرینەک ل ئەلف بێتکێ عەرەبی داچێ کرن و ژ ئەلف بێتکێ عەرەبی،ئەلف بێتک ورێنڤیسەک تایبەتە کوردی دەرئینان ، کوئەو رێنڤیسا هەمەن ئەڤەیەکوئەم نۆکەبکار دبن . ل ئیرانێدا ژی کوئەمحەموو دزانن بەری سەرکەتنا شۆرشا ئیسلامی، کوردی نڤیسین یاساغ بوو. ئەمما دگەل سەرکەتنا شۆرشا ئیسلامی وگۆرەکی ئەسلا پانزدێ یە قانوونا بنێشەئییە کۆمارا ئیسلامییەئیرانێ خاندن ونڤیسین بزمانێ کوردی ئازادبوو ، کوردێد ئیرانێ ژی رێنڤیسا کونهە گۆڤارا«سروە» پێ تێتەنڤیسین ،پەسنین .

ئەمما سەرهەژمارو چاوا نییا ئەلف بێتک ورێنڤیسا کوردی یاکو ئەم نهە بکاردبن ژی هندەک دژایەتی ونەوەکی- هەڤبوون هەیە . باساخەبەرێ هندەک ژنڤیسکارێد کورد ل سەر وێبیرورایێنەکوپیتێد . ع . ظ . ص . ث .ل ئەزمانێ کوردی دا هەنەلێ هندەک ژ ی ئەڤان پیتانەکوردی نزانن ودبێژن کوئەڤ پیتانە عەرەبینە. ئەمئەڤێ داوەریوقەزاوەتێ هێڤی یا زمانێ کوردی ڤە دهێلن، داکوو ئەڤ ئەزمانە بخۆ ل بارا هەبوون ونەبوونا وان پیتانەوهەژمارا پیتێد هەیی دا داوەری یێ بکە .

**هەژمارا ئەلف بێتکی کوردی:**

ب سەرلێکولینا پشکەک زۆر ژنڤیسکاروزمانزانێد کورد ئەلف بێتکێ کوردی سی و هەفت پیتن کو وەکی پشکا زۆر ە ئەلف بێتکێ زمانێد دونیایێ دوودەستەنە :

١- دەنگ ٢- دەنگ بزوین

یایەکێ"دەنگ": دەنگ ل فارسی دا " حروف بیصدا " ل عەرەبی دا " صامت" ول ئینگلسی دا ژی " Consonants " دبێژنی . هەژمارادەنگا ل ئەزمانێ کوردی دا .٢٩ پیتن کوبریتینە :

**ئـ - ب - پ - ت - ج - چ**
**ح - خ - د -- ر - ز - ژ**
**س - ش - ط - ع - غ - ف**
**ڤ - ق - ک - ک̌ - گ - ل**
**م - ن - و - هـ - ی .**

هندەک ژنڤیسکارێد کورد هەژمارەک زێدەژڤێ هەژمارێ رادگەهینن باساخەبەرێ دبێژن کو : دو "پ" ، دو "ڕ" دو "ل" و"ظ" "ص" ژی ل ئەزمانێ کوردی داهەیەئەوانا بۆنیشان دانا ڤان جوڕەپیتێد هەقدەنگ وهەڤرەنگ ئەڤێ دروشمێ ( ٚ )ل ژۆریان ژێری وان جوڕەپیتانە دادنێن. ئەمما ئەڤ پیتانە ل چەند گوتەیا زێدەتردا چنینن ئەوژی ل هندەک زاراوێد ناڤچەیی دا .

یاباش ئەوەکو ئەڤ جوڕە پیتێد هەڤڕەنگ وهەقدەنگ ، پیتێد بنێشەئییە زمانێ کوردی نەیێنە هەژمارێ.چو ن بلی سەرلێ شێڤاندنا خاندوانا چ قازانجەک دی یە وان چنینە . هندەک ژ نڤیسکارو زمانزانێد کوردل سەرڤێ بیروباوەرێنە کوئەگەر ئەڤ پیتێد دووماهی یێنەیێنە راچاڤکرن ئالۆزی دکەڤە نیڤەکا پشکەک ژگۆتەیێد کوردی،کول نڤیسینێ داوەکی هەڤ ول مەعنی یێدا نەوەکی هەڤن. باساخەبەرێ دبێژن " پار" یانی پشک ئەمما "پ̌ار" کوپیتا وێ یەیێکێ گرانترە، یانێ سالا بهۆری " کەر" یانێ لەت ، " کەر " ژی کوناڤێ حەیوانەک بێ ئازارە وچەند گۆتەیێد وەها هەڤڕەنگ بۆسەرپەلگە دینن وداخازا سەرنڤیساڤان جوڕە گۆتەیادکەن .

یادوویی " دەنگ بزوین": کول فارسی دا " حروف صدادار" ل عەرەبی دا " **حرکە** " و ل ئینگلیسی دا ژی " Vowels ": دبێژنێ ، هەژمارا وان ل ئەزمانێ کوردی دا هەشت پیتن ،کول ڤێ رێنڤیسا مەیا هەیی داهەرتنێ بۆهەفتا نیشانەهەیە ، ئەمما بۆ دەنگ بزوینەکێ چ نیشانە چنەیە ، ئەوژی دەنگ بزوینا

" I " یە کودەنگ بزوینا بەشارتی ژی دبێژنێ. دەنگ بزوینێ زمانێ کوردی ئەڤەنە :

"ئا ،ا" ، — A — "ئی، ی، یـ ،" . Î ."ئە ،ـە ، ە " E " ئێ، ێ ،ێـ" . Ê ." ئۆ ،ۆ "O" ئو ،و" U " ئوو وو" Û ، İ :

A - E - Î - Û - Ê - I - O - U

ئەڤە دەنگ بزوینن کو رێنڤیسا کوردی ژیا فارسی و عەرەبی جودا دکە باساخەبەرێ فارس دبێژن : "مَرد" کوپێ رێنڤیسا کوردی ئەوگوتەیا وەهەتێتە نڤیسین: " مەرد" یان عەرەب دبیژن : " رَجُل" کوپێ رێنڤیسا کوردی ئەو گۆتەیا وەهەتێتە نڤیسین : "رەجول"نەئەمێ بۆهەر یەک ژدەنگ بزوینێ کوردی چەند نموونەیا بینن :

ئا = ئارد، دار، بار

ئی= ئیسال ، ئیرۆ ، نیڤرۆ شیف ، شادی

ئە= ئەز، پەز ،رەز ، کەس .

ئێ= ئێرە ، مێر ، دەرێ، وێران .

ئو= کورد ،گول ،بولبول .

ئۆ= گۆل، دۆل،مۆری، سۆر .

ئوو= دوور ،خوون، بوون ، نوور

ل هەرهەفت دەنگ بزوینێ ژۆرین بلی دەنگ بزڤینا ڤەشارتی ( İ )شەش دەنگ بزوین ل فارسی وعەرەبی دا هەنە، دەنگ بزوینی ( I ) وئو ل وان هەردوزمانا نداتونەیە کوئەمئێرەدا وان دەنگ بزوینێ کوردی ل همبەریێ فارسی دا دنڤیسن :

ئا — ا = (آ — ا )

ئی — ی — ئیـ — یـ = (ا ی — ایـ — یـ — ی)

ئە — ـە — ە = (اَ — ـَ)

ئێ — ێ — ئێـ — ێـ (اِ — ـِ)

ئۆ — ۆ= (اُ ، ـُ )

ئو —

ئوو— وو= (ا و — و )

ئەما دەنگ بزوینا ڤەشارتی کول فارسی دا"مصوت مستتر" دبێژنێ، ل کوردی دا هەروەکی هاتەنڤیسین هەیە، لێ بەلێ ل ڤێ رێنڤیسا مەیا هەیی دا چ نیشانە بۆوێ پەیدا نەکرنە. ئەما ل رێنڤیسا کوردییە لاتینی دا ئەڤ دروشما " I " کوئی یا سڤک دبێژنێ بۆوێ دەنگ بزوینێ دانانە ، دەنگ بزوینا ڤەشارتی ل گوتیێد وەکی : بزن، مرن ، هاتن ، کرن و .... دا هەیە .

ئەڤەبوو هندەک ل سەر چاوانی یا رێنڤیسا کوردی خاسما بابەتپیت وئەلف بێتکێ کوردی دا . ئەما هندەک ئالۆزی ونەوەکی هەڤ نڤیسین ل چەند بابەتێد دی داژی بەرچاڤا دکەڤن کو پێدڤی یەل کوتایا ڤی گۆتارێدا بێتە شرۆڤەکرن ؛

١— عەلامەت ونیشانێد کۆم یانێ " جمع " ل کوردی دا ، سێنە : "ان —ێ ن —ێد"ئەما هندەک نڤیسکارێد مەباتی"یێد" ("یێت ") دنڤیسن ،کو هەلەیە. چون پێشەنگێ تۆرو ئەدەبا کوردی یێدوەکی مەلایێ جزیری وئەحمەدێ خانی "ێد "و "ێ ن" بکار برنە . نەکو "ێ ت " ،هەم ژی ل سەردەڤان "ێ د" تێتەبهیستن .دقەومە کول هندەک ناڤچاندا " ێ ت " تەلەفوز بکەن ، ئەماهەر وەکی هاتەنڤیسین پشکا زۆرە تۆرەڤان ونڤیسکارێد کورد " ێ د" یان ژی "ێ ن" بکار برنە . باساخەبەرێ مەلایێ جزیری دبێژە :

ل **گولێن** تەی تەرونازک کو
سەحەرگرتی خوناڤ
دئەباریق وقنینان ژحەسەد
سۆهتی گولاب .
هەردوو**برهێن** تەنە مێحراب
چ ئیمان وچ کوفر .
بوود ونابوود کویەکن ئەڤ
چ سەواب وچ عێقاب .

یان ئەحمەدێ خانی مەم و زینێ دا وەها دبێژە :

فەردەک ژ **سەحابەیێد کوبار**
پێنجسەد ژ **دلاوەرێد** کوفار
عێرفان **طەلەبێد** ساحب ئێدراک
دەرحەقێ تەگۆت ماعەرەفناک

ئەڤ نەه **سەدەڤێد** پڕمراری **رۆژێد** سپی **شەڤێد** تاری هەرسێ **وەلەدێد** پرمەوالید غەبراو سەما دگەل مەقالید

٢— وێ یاعەتفکول زمانێ کوردی دا "ئوو" ل ئینگلیسی داژی ( and )

ئەلف بێتکی ئێزدیان

ا ب پ ت ج چ ح خ د ذ ر ز ژ س ش ص ض ط ظ ع غ ف ق ک ی ل م ن و ه ی- ئێ- ئی

دبـێژنێ.هەرچەند کـوئـەڤ ،
گوتەیا ل پشکا زۆرەزا را وێـد
کوردی خاسما پشکا باکووری‌دا
" ئوو" تەلەفوز دبە ، بۆسانا
– هی بوون وزوونڤیسینـێ
یا باش ئەوەکو ئەم وێ یاهەر
ب یەک " و"یێ نیشـان دەن
وبنڤیسن،چون نڤیسینا وێ بڤی
جوری " ئوو" بلی گیرۆکـرنا
نڤیسکا راچ قازانجـەک دی
چنەیە . باساخەبەرێ هندەک
دنڤیسن: "ئەز ئوو تو
چێترە کو ئەورستەیا وەهـا
بێتە نڤیسین:" ئەز وتو" .

ل بنێشێ دا ئـەگـەر
کوتاترین پیتا گۆتەیا ییێکێ
دەنگ بزوین بە "ئوو"تەلەفوز
دبە ئەمما ئەگەرکوتاترین
پیتا گوتەیا ییێکێ دەنگ بـە،
" ۆ"یان "و" تـەلەفوز دبە
بینانی :" سێڤی ئووخەجێ"
"رامیاری ئووئابووری " ، "دا–
ئووباڤ"
"رەنگ ودەنگ " ،سوا روپەیا "

ئەمما ئەڤ قانوونـەژی
دبە هەگەرا ئالـۆزی یێ و
تشتەکی زێدە وبی وێجـە
هەروەکی هاتە نڤیسین یا باش
ئەوەکوئەم ل نڤیسینێ خوەدا
هەر "و" بکاربـەن ، نەکو
" ئوو" .

٣– " ئی " یا نسبەت :

ئەڤ ئی یا ژی ئـەگـەر
گۆتەیا نسبەت دا یـی
کوتاترین پیتاوێ " دەنـگ-
بزوین"بە"یێ" لێ ئەگـەر
"دەنگ "بە"ێ" لێ زیدەدبـە
بینانـی :

١– برایێ من " ، "فەقی یێ
تـەیران " ،" مەلایێ باتەیـی
" شوویێ خەجێ "

٢– ئەحمەدێ خـانـی "
" عەمەریکێ سەردار"

ل دەما کۆمکرن یـانێ
" جمع"داژی ئەڤ ییێکە دەبێ
کوبێتە راچاڤکرن ،یـانێ
وەها بێتە نڤیسین:برایێدمە
فەقی ییێدمزگەڤتێ،کوردیێـد
زانا و .....

٤– هندەک ل نڤیسکـا را
گۆتەییێد وەکی :" خـاندن
خاستن ، داخاز ، خازی ،خارن
و ..... وەها دنڤیسن:خواندن
خواستن ،داخواز ، خـوازی

## بەرەو زمانی یەکگرتوو

خوارن و ... هەرچەند ل
هندەک زاراوێد کوردی دا دقە
- ومە ئەوجورە گۆتەوپەیڤانە
وەکی دەستەیا دوویێ بێنە
تەلەفوزکرن ، ئەمما یاباش
ئەوەکو وەکی دەستەیا یێکێ
بێنە نڤیسین .چون پشکا
زۆرە کوردا هەر وەکی
دەستەیا یێکێ تەلەفوزدکەن،
هەمژی نڤیسیناڤان چورە
گۆتەیا وەکی دەستەیا یێکێ
ساناهی ترە .

٥- ل بارا گۆتەیێد
بیهانی یانێ بلی کوردیدا
هندەک ل سەروێ بیرورایێنە
کودەبی یا ناڤ وگوتەیێد
بلی کوردی هەروەکی خۆبێنە
نڤیسین باساخەبەرێ دبێژن
کو گۆتەیێد وەکی:

صلاح الدین ،بیت المقدس
نظام الملک و .... دەبێ کو
هەرچاوا ل عەرەبی وفارسی دا
تێنەنڤیسین ،ل کوردی دا ژی
ئوسا بینەنڤیسین .ل بەر-
سڤاوان نڤیسکارادائەم
دشێن بێژن گەلۆ وەختێکو
ئینگلیسییەک باساخەبەرێ
گۆتەیا ناڤ گۆتی ب
ئینگلیسی بنڤیسە ئەوانا
ئینگلیسی دنڤیسەیان هە
فارسی وعەرەبی. بێگۆتن
بەرسڤاوانێ نەرێ یە.
دەئیجاب ڤی جورەیی ئەم ژی
دەبێک تەواوی گۆتەوناڤێد
بلی کوردی کوئەمبکارد بن
هەبکوردی بنڤیسن . باسا
خەبەرێ گۆتەیێد زۆرین

ل دەبێک وەها بێنە نڤیسین :
سەلاحەدین . بەیتولموقەدەس
نزامولمولک و .... یانێ
چاواتێنە تەلەفوزکرن دەبێک
ئوسا ژی بێنە نڤیسین .

هەرئوسا پیتێد " ص، ث ،
س " ،"ذ - ز - ض - ظ " ،
ل گۆتەوپەیڤێدعەرەبی
وفارسی کول ناڤ زمانێ
کوردی دا جی بوونە ،هەبن
دەبیک ئەوجورەگۆتەوپەیڤانە
ب رێنڤیسا کوردی بێنە
نڤیسین ،یانێ بەرێکێدا ل
جیهێ وان پیتانەدا پیتێد:
"س"، " ز" بنڤیسن .

٦- ئەمما ئایات وگوتنێد
خودێ وپێغەمبەرا دەبێک
ب عەرەبی بێنەنڤیسین .

٧- ل بابەت گۆتەیێد
عەرەبی یە خودان تەشدید
- دا ژی دەبیک بێتە گۆتن
هەرپیتاکول ناڤ گۆتەیێد
عەرەبی دا خودان تەشدید بن
دەبێک دوجاری بێنەنڤیسین
وەکی : امّا = ئەمما - قصّاب
قەسساب - بقّال = بەققال و ..

وا داچلەکیام لیچم هەڵ زریا. قیرە خو قیرە نەو. نەرە نەڕی شێران بوو. ئەرێ دەنگ خوەی بوو.کاکە " سێ لای" حەزی بە تەخەللوس نەئەکرد. دڵ کەسیچی نائێشان.تەک بووچکا بووچک و تەک گەورا گەورە بوو. تەبعی وەک ئاوکانی شەفا رەوان بوو.لە خەتەنە سووران. ناونیان.ناوک بڕان و مارەبڕانئەوە بگرە تا خەنەبەنان وفاتیحا خوانی تا چاو رۆشنی وجێگە خاڵیانە...خولاسە بۆ هەچی چتە شیعرێکی ئەوت.نەوەک بێژی لاسای کەسێکی ئەکردەو نە عەسڵەن خوەی درگا و دەروازەی ئەدەب بوو. نە سەبک ودەق ورەخنە وئالەم چتە قۆڕگەلیە( بە قەوڵ خۆی) ئەزانی نە لەسەر شێوەی کەسێ کاری ئەکرد. دەسی بۆ کوچک و بزچک حەتا تۆڵاشە ببردایێ ئەوونە شیعر! خواوڕاسان خلووقەتەن شاعیر بوو ! ئێمە بەمناڵی نەمانفامی ئەیژێ چە!گەورەیچ بووین خوا نەیکردە قسمەت لێی حاڵی ببن .ئێستەیچە وئێسە زوانی نازانین.چت حاڵی بوون چتێکە بە هەرکەس نادرگێ. هەروا کە بێژگە خوەیو دوسێ نەفەر کە لە هەچی کاسا کەوچک بوون کەس لەو مەعنا زەریف و نوکتە دەقیق گەلەتی نائەگەین .ئەوانیچ بەشیان دریاو. ئەلحەق بە دەم خەلکیچەو بوون. نەخوازەڵا کەسێ بمردایت .حەتا ئەگەر ناویچیان نەزانیایێ تا سەر زیارەت ئەیان برد. فاتیحایکیان دائەخست تاوتەکەیچیان ئەهاوردەو ، رەنگ ورەوغەن و گوڵاو و کافووریان ئەکرد و دایان ئەنیا تا هەسارەی تر ئاسمان شیعر و شاعیری داکەفێ .بەمەیچەقەناعەتیان نائەکرد. بە تەواو هێزەوە دەستیان ئەکردە شی کردنەوەی چتەکانی" زوانم لاڵ شیعرەکانی) ئەرێ دەنگ کاکە سێ لای وەک زەنگ خەتەر بانگێ پووڵی دزیاوێ ئێمەی ئۆمەتەکەی خەوەر کردو وتی :

"وردەونەو برا گەل !

ئەمە ئەوەڵ کارەکەس . خۆلاسەی کەلام بێژمە پێتان ئەی مەخلووقە چاوەلیان ها دەمەیل ئێمە ئەلەو. ئێمە ئەلیش چاوەلمان ها دەمەیل ئێوەئەلەو. نەکەنە کاری سەرمان داخەین . خولاسەی کەلام. خراو نایژم

## بەرەو زمانی یەکگرتوو

مێژوو وەشوێنمان ئەڕوانێ
پوختەی کەمەوە. هەرکەستان
نەیێ من هەرئەچم بەلام.."
تەنگەنەفەس بووم قسەم
بۆ نائەهات .وەلێ نەم
درکانایی دیقم ئەکرد. وتم
قوربان ساقەی سەرمنالەکانت
بەسیەا! داخۆزە ئەقەلەن
بەیەکەو بچین .بۆچە ئەونە
تونی باوکە؟ بۆکوێ بچین
هەر ئەچی ؟ ئەچین هەر
ئەچی . فرە کەس چوون .
بەحس چتێ ترە ناسلامەتی
گەرەکمانە ئەنجومەن دروس
کەین ."
کردیە جواو:
" برا قاوا کاکەدەنگ
وەسوحەو قسە ئەکەن .مەیکە
- نە قاڵ دەم، بێلن
منیچ نەزەر خۆم بێژم.
ئاخر هەر ئەم بێ تفاقیە
هەڕگی کردە سەرمانا.بووینە
پەندی عالەم. چوارمان
قسەمان یەک ناگرێتا !
ئەڵبەت بوەخشن مەنزوورم
ئەوە وەکەستان نەبێ. بۆ
ئەنجومەن من هەر ئەچم.
خولاسەی کەلام برائەل
خیرەتتان بێ وەقەوڵ شاعیر
ئەیژێ من .خولاسەی کەلام
کە سەوادم نیە" خاکی
بەرپێی تێکوشەرێکی کوردم"
**چەقۆی سێ ئەڵماس و**
لێم بدایێ خونم دەرنائەهات
خواگرتگ چەپ ورا!س "خولاسەی
کەلامی" ئەدا تەحوێل.
**قسەکانیچی دانەیەکی برای**
**دانەی‌تر نەو**. داخم لەوا
ئەهات هەرکە هەرچێکی
ئەوت باقی خەڵکەکە چاویان
ئەوڕیە ناوچاو منو بە
ئیشارەت برۆ و برژانگ
ئەیان وت لێ نەویتەو
بۆ جێی هاوردمانو. منیچ
لەحێوەتا ئەرەق زەردوسوورم
ئەڕژاند .

تۆبە یارەبی قسە،قسە
تێرێ. ناو مەجلیسەکا
بووین مەیمانەکان
باوێشکیان ئەدا. بەعزی
گێج خەو بوون. ناوسەرما
ئەتوت دەوڵە سڕنا ئەکوتن
نەمئەتانی بەکەسیان
بێژم راس ئێژی. نەیچم
ئەوێرا بێژم وانیە واسە
**بەرم بابوو پشتم کەنەلان.**
خوا مەرگ . خوا قوڕگیچم
هاتەوەیەک . خولاسەی کەلام
" رەحمەت لەقەور قەیمی
وا هیچێکیان نەهێشتگەسەو.
**لای خیگەو دانیشی چەور**
**ئەوی. لای دیزەو دانیشی**
**رەش ئەوی**." لای "سێ لایە..
خولاسەی کەلام!! ئەستەخفیر
ئەستەخفیرەڵڵا." بەسایەی
ناوچاو ئێوەو هیممەت
خاس گەلەو قولەی کەڵەشێر
بەرزەو بوو. کا ئێرج
خەتم جەلەسەکەی ئیعلام کرد
ئیشاڵڵا هەرلەم شەوگەلا
دوور لەرووتان دائەنیشین
تا بزانین بەرمان بەکوێ
وە ئەوێ. خوا لەمە
خراوتری نەکا .

**تۆملەق لە دەما شکاندن :**
قسەی زل لەزاری کەسێک
نان .فێری لاف و گەزاف ،
کردن .
**رملێ پێکان :**
تیر لە تاریکی دا
هاویشتن .
**بەقە کتێو خوێنێ قسەکردن:**
زۆر گوتن .
**کالا بە بالا بڕیان :**
پڕ بەپێست بوون .
**گۆچ کرن :**
فرچک گرتن . عادەت
کردن بە.
**بەرتەونانە:**
ئاوازێکە فۆلکلۆری کە
کچ وژن لەکاتی تەون کردنا
ئەیخوێننەوە .
**هەرکەسی لەقەور خۆی ئەنرگێ**
هەرکەس بەرپرسی کاری
خۆیەتی .
**حەق "تایی" لە " دولاوی**
**سەندەوە :**
"تایی" و"دولاوی" ناوی
دوو گوندی ناوچەی سنەن .
خەڵک "تایی" لەکوێخایان
دابوو ئەویش بە تۆڵەی
ئەوە خەڵکی"دولاوی"ئەزیەت
دەکرد .

خطا کرد دربلخ آهنگری
بەکاشان زدندگردن **مسگری**
هاومانایە لەگەل بە کەر
ناوێرێ بە کۆپان شێرە.

**به هەر رەنگێکی ئەکەی به گوڵخاری مەکە.:**

گوڵخار چەشنە رەنگێکە لە تەون وفەرش کردندا دەکار دەکرێ.گۆیا جارێکی ژنێکی تەونگەر" گوڵخاری" زۆر دەمێنێتەوە بەخەمچی دەڵێ " بە هەر رەنگێکی ئەکەی بە گوڵخاری مەکە." لە قسەکردن دا کاتێک بەکار دێت کە کەسێک بیەوێت مەبەستی گرینگ بۆ بایەخ کا . جاوەبیری دێننەوە کە وا نەکاوئەو مەسەلەشی وەبیر دەخەنەوە.

**موو لەئاشدا (ئاسیاو) سپی کردن :**

عومری بێهوودە. بۆ ئەزموونی.کاڵی وتێ نەگە - یشتوویی .

**نان بەکەس دانە قەرز:**

شووتی لەژێر هەنگڵ نان .فوو تێ کردن.تاریف کردنی نارەوای کەسێک .

**بنکڕ خواردن :**

بەرماو خواردن. ورکە خۆری کەسان کردن .

**قسە بۆ دز کردن :**

بەئینساف بوون .

**مەمسی بۆچەس مسەفای رووتی :**

قسەی دەق ودۆغری کردن.

**شەر لەشێفا ئاشتی لە خەرمانا :**

شەڕی خۆم لەم سەرەوە دەکەم (جنگ اول بەاز صلح آخر).

**شاکامی هاوردن :**

تانە لێدان .

**بێزگ کردن :**

مەگیرانی کردن. مژدی کردن .

**شنگ ورێواس وبەناوگێلاخەو پاڵمە:**

چەن جۆر گیای بەهارین لەسەریەک بە گیا دوکلێو نێودێرن .

**هەمەگیا :**

بریتی یە لەچەند گیای جۆراوجۆر وەک سوورەبنە، پاڵمە، گێلاخە، شیرین شاتەڕە قازیاخە، گۆزروان، هەلامە پەلەشوانە ،بزنەریشە ،هەرمێلە دریلە، بەنا ،خولەشیرەو....

ئەم گیایانە ئەکولێنن و دوای گوشاندن بەهێلکەوە سووری دەکەنەوە و بەم خوراکەکە دەڵێن "بورەقانی"

**لەبەڕی یەوە هاتگە:**

ماندوو شەکەت وبرسیە .

لە سەحراوە هاتووە .

**ئەیماڵی وئەیهاڕی :**

بە پەلە دەیخوارد. هەڵیدەلووشی .

**کوڕ حاجی نەعمان :**

مەسەلە بۆدەوڵەمەندی. لە موکریان دەڵێن کوڕی قەرەنی ئاغای مامەش .یا کوڕی حاجیە لاری ورمێ .

**هەر شەوە قەورێ ناسێن :**

گۆڕ بەگۆڕ بوون .

**هەشت هەشت کردن :**

کاوبا کردن. تاریفی خۆرایی کردن .

**کوا و کوڵە:**

کەواو سیخمە .

**چاو چەرمگ بوون :**

چاو سپی بوون. مردن .

**وشتر چەی بەسەر عەلاقەبەنیەو:**

هەمزە چی بە هەباسی.

**لە هەچی کاسا کەوچک بوون.**

وەک لەپە بوون لە هەموو چێشتێکا بوون.خۆتێهەڵقوتاندن .

**کانی شەفا :**

کانیەکی سارد وزوڵاڵە لە کێوی ئاویدەری سنە .

**چەقۆی سێ ئەڵماسی :**

" چەقۆی سەیدئەڵماس" سەید ئەڵماس سەنعەتکەرێکی بە ناوبانگ بووە لە گەرەکی "سەرتەپۆڵەی" شاری سنەدا کاری کردووەوچەقۆی تیژی بەدەسکی شاخ دروست دەکرد .

**قسەکانی دانەیکی برای دانەیکتر نەبوو:**

قسەکانی هاتەران پاتەران وبێ رەبت بوون.

**بەرمابوو پشتم کەندەڵان :**

رێگام لێ بەسترابوو رێگەی پاش وپێشم نەبوو.

**لای خێگە دانیشی چەور ئەوی یا لای دیزە دانیشی رەش ئەوی :**

یانی لەگەڵ هەر کەس بی چاک یا خراپ کارت لێدەکا. گایەک لە پاڵ گایەکدا خووی یەک دەگرن.

شا عەباس عادەتی وابوو شەوانە بەرگی دەگۆڕی و بە تەنێ لەنێو شار بە کووچە و کۆڵاندا رادەبرد تا لە وەزعی شار بگا و خەبەر وباس بزانێ.

شەوێک لە شەوان بەنێو شاردا دەگەڕا بەری بەیانی لە قەراخ شار کابرایەکی دێهاتی دەبینێ. یەکی رووتی باریک و لەجەر* کاڵەکێکی لە تێڕ ناوە و بە گوێدەرێژەکەی داهێناوە و وردە وردە دێتە شار.

شا عەباس لێی دەچێتە پێش ودەڵێ :

- کاکە ماندوو نەبی .
- خوات لێ رازی بێ .
- بارت چیە ؟
- کاڵەک
- بۆ کوێی دەبەی ؟
- بەتۆ چی ؟
- برا نارەحەت مەبە جوابم بدەوە.
- دەیبەم بۆ بارەگای شا!
- شا کاڵەکی بۆچیە ؟
- بۆ هیچ بەڵام جاران دەمبردە، مەیدان و چەقاڵ بەقاڵ بە تاڵان لە دەستیان دەردێنام و پارەکەشیان نەدەدامێ ئێستا دەمەوێ بیبەم بۆ شاعەباس .
- بەڵکوو شاعەباسیش هیچی نەدایەی ئەودەم چ دەکەی ؟
- کاکە بەتۆ چی ؟ دایان باشە نەیاندا بەگۆڕی بابی شاوە.مەحتەلم مەکە رێم بەردە با بڕۆم .

کابرا شای نەناسی. رێگای بارەگای گرت و رۆیی. شاعەباس بەپەلە خۆی گەیاندە بارەگا و بەرگی گۆڕی ولەسەر

تەخت دانیشت ودەستووری دا :
- یەکێک دێ و کالەکی پێیە پێشی مەگرن با بێتە ژوور. یەکسەر بیهێننە ئێرە .
کابرا پاش ماوەیەک گەیشتێ، ئیزنیان دا وەژوور کەوت . گوێدرێژەکەی لە داری نێو حەوشەکە بەستەوە و چوو بۆ لای شا .
گوتی :

- شا سلامەت بی. خودا دەوامی عومرت بدا . بارێکم کالەک هێناوەتە خزمەتت ئەگەر لەدەستت دێ کۆمەگێکم پێ بکە.
- کابرا کەس پێی گوتووی کالەک

بۆ شا بەری ؟
- ناوەللا بەلام هەموو جارێ کالەکم هێناوە و بردوومەتە بازار و بە تالان لەدەستیان دەرهێناوم بۆیە هێناومە بۆ تۆ .
شاعەباس دیسان گوتی :
- کێ پێی گوتووی بیبە بۆ شا ؟
کابرا فکری کردەوە نەکا کابرای بەیانی

شا بووبی. بە توورەیی گوتی :
- قوربان ئەگەر شتێکم دەدەیەی باشە دەنا هەر ئەوەیە بەیانی عەرزم کردی .
شا زانی کابرا ئەوی ناسیوەوزۆریش

بەجەرگ و بەغیرەتە. دەستووری دا سەت تمەنی بۆ بێنن و بیدەنێ .
هێندێک وەزیر و وەکیل لەوێ دانیشتبوون رەخنەیان لە شا گرت و گوتیان :
- کالەک بایی دە تمەنە بۆچی سەت تمەنی دەدەیەی ؟

شا بە بیستنی ئەم قسە دەستووریدا سەت تمەنی دیکەشی بدەنێ. وەزیر وەک ئەوە کە لە گیرفانی ئەو بچێتە دەر، دیسان رەخنەی لە شا گرت وشا دیسان سەت تمەنی دیکەی دا بە کابرا. وەزیر پێی وابوو هەرکەس وەک ئەو پێی نەڵێن وەزیر وجلکی نوێی لەبەردا نەبێ ئاقڵێشی ناتەواوە.

ئاقل نیە هەر ئێستا دەچم و پارەکەی لێ دەستێنمەوە.

– باشە برۆ ئەگەر تۆ لەو ئاقڵتر بووی هەزار زێرت دەدەمێ دەنا بۆخۆت دەزانی!

وەزیری سەرلێ شێواو وەدەرکەوت. ئەسپیان بۆ هێناو وەدووی کابرا کەوت کەم رۆیشت زۆر رۆیشت کابرای دیتەوە.

– کابرا راوەستە کارم پێتە.

– کابرا وەزیری ناسیەوە و لێی

وەزیر و چەند دەستەو دەبارەی ئەو رەخنەیان بەرز کردەوە چون زۆریان پێ سەیر بوو.

شا گوتی:

– من ئەو کابرایەم تاقی کردۆتەوە زۆر ئاقڵە و جێی خۆی بوو ئەم پارەی بدەمێ.

وەزیر گوتی:

– بۆ ئەوە کەپێت بسەلمێنم کابرا

هاتە پێش و گوتی:

– چ کارت بە منە جەنابی وەزیر

– من لە لای شاوە هاتووم سێ پرسیار لە تۆ دەکەم ئەگەر نەیزانی سێسەت تمەنەکە دەبەمەوە بۆ بارەگا.

ـ جەنابی وەزیر! من چووزانم‌پرسیار جواب بدەمەوە من هیچ نازانم. سەوادم نیە مەردی خودابە ڕێم بەردە با بڕۆم .

بەڵام وەزیر دەستی هەڵنەگرت وملی نەدا ناچار کالەک فرۆش گوتی :

ـ پرسیارەکانت چن ؟

وەزیر گوتی :

ـ بلێ بزانم چەند ئەستێرە لە ئاسمان هەیە و شەوانە دەبیندرێن ؟

کابرا هێندێکی بیر کردەوە وگوتی :

ـ چەند جار ژماردوومە بە قەت تووکی کەرەتالەی خۆمە .

وەزیر گوتی :

ـ وا نیە .

کابرا کوتی :

ـ ئەگەر باوەڕ ناکەی فەرموو بیژمێرە.

وەزیر زانی ناتوانێ ئەم‌کارە بکا ناچار لێی قەبووڵ کرد وگوتی :

ـ باشە ئەدی نێوەڕاستی دونیا کوێیە ؟

کابرا گوتی :

ـ من لەگەڵ باوکم چەندجار پێواومە ڕاست ئەم جێگە کە من وتۆی لێ ڕاوەستاوین نێوەڕاستی دونیایە .

ـ باوەڕ ناکەم!

ـ باوەڕ ناکەی فەرموو بی پێوە !

وەزیر زانی ئەم کارەشی پێ ناکرێ ناچار لێی قەبووڵ کرد و گوتی :

ـ باشە دەنا پێم بلێ بزانم خودا ئێستا خەریکی چیە ؟

کابرا گوتی :

ـ ئاخر منی ڕەش ورووت و چلکن و بۆربەسواری کەر چووزانم خودا خەریکی چیە ؟ هەرکەس جلکی جوان و ئەسپی چاکی لە بن دا بێ و وەزیر بێ جوابی ئەم پرسیارە دەداتەوە .

وەزیر کوتی :

ـ ها من ئەسپ و جلکی خۆمت دەدەمێ تۆ وەلامی ئەم پرسیارە بدەوە.

کابرا جلکی وەزیری لەبەر کرد و سواری ئەسپ بوو وگوتی :

ـ دەزانی خودا چ دەکا؟ ئەوە خەریکە جێگای خەڵک دەگۆڕێ. هەرکەسە بەپێی خۆی کاری پێ دەسپێرێ. من‌ئەوە بوومە وەزیر و تۆش بوویە کەرەوان !

ئەوەندەی گوت و بەرە و بارەگای شا ئاژوا. وەزیر بەفێڵ هەرچی کردی

نەیتوانی بیگاتێ و کابرا بۆی دەرچوو.

گەیشتە بارەگای شاعەباس. شا و وەزیرەکان دیتیان ئەوە کابرا جلکی وەزیری لەبەردا و گەڕاوەتەوە. کابرا هەموو ڕووداوەکەی بۆ شا عەباس‌گێڕاوە. هێندەی پێ نەچوو وەزیر بە شەرمەساری گەڕاوە و سەری بەرداوە .

شا گوتی :

ـ ئەقڵ بە شار و دێ و وەزیر و فەلا نیە لەسەر قەراری خۆت ڕاوەستە. من دەزانم تۆ بۆ وەزیر نابی.

تەشریفت بچێ بۆ دێ و خەریکی کالەک فرۆشتن بە و بە زەوی و زار ڕابگە. ئەویش ئەوە خودا کردوویە بە وەزیر.

منیش هاتمەوە لەولاڕا
کالەم‌دڕا وچمپێ نەبڕا

# نازانم

**مارف ئاغایی**

چوارەمی سەرەتاییم تەوا و
کردبوو. دوایین رۆژی وەرز
هاوین بوو. دەبا بۆ درێـــژە
پێدانی خوێندن بچم بۆ شـــار
و گوند بەجێ بێڵم . داخـــی
ئەو دوور بوونە وەکوو خـــۆرە
دەیخواردمەوە . من بەئاهەنگی
شمشاڵی شوان و دەنگی بەرخ و
کاریلە و جریوە جریوی نێوچڕو
دارستانان راهاتبووم و بـــە
جوانیەکانی رژد و کێو و رازو
رەوەز چاوم پشکووتبوو. دڵـم
بە دیتنی ئاوهەڵدێر، گوڵـی
کێوی و لێرەوار و گۆڕەپـــان
گەشەونەشە ی دەکرد. من لـــە
نێو تۆز و خۆڵ و مژدا رۆژم
لێ ئاوا ببوو و لە ژێرتینـی
کورسیلەدا و لە نێومدبەقـی
قورماوی رۆژم لێ ببۆوە .

بەڵام هەمووی ئـەوانـــەم
بەجێ هێشت و بۆلای شاری وەڕێ
کەوتم . خێرا ئاوڕم دەداوە
و لە نێزیک گوند را هەتاسەر
کێوەکان بە وردی بە پـێـش
چاومدا تێدە پەڕین بە جێـم
هێشتن و رۆیشتین.

گەیشتینە شار ئەوجێگایەی
کە دەبا تێیدا بژیم بـــەڵام
هەموو شتێکی بۆمن نامۆ بـوو
لە هارە هاری ماشێنەوە بگرە
هەتا شەقام و ئینسانەکانی .
کەوشەکانم دڕابوون دەگـــەڵ
باوکم چووینە دووکانی کـەوش
فرۆشێکی پیر و باوکم گوتـــی
جووتێکمان چەکمە دەیە بۆئەو
منداڵەی .

گوتم : بابە بۆ چەکمە زووە
رۆژێ جووتێکم کەوش پێ ناکرێ
مانگێکی دیکە دەبێتە بەفرو
باران و ئەو چەکمانە بۆ ئەو
دەمیش بەکارت دێن .چەکمـەی
بۆ کرِیم و باوکم ماڵ ئاوایی
کرد و رۆیشت .دەگەڵ کوڕێکی
خەڵکی گوندی خۆمان کـــەدوو
ساڵ لە من گەورەتر بوو وهەر
لەو شارەش خوێند بـــووی
وەتاغێکی چکۆڵەمان گرتبـوو .
شەو هەتا درەنگانێک پێکەوە
قسەمان کرد و لە پاشـــان
نوستین . بەیانی بـــەرەو
مەدرەسە وەڕێ کەوتم . زەنـگ
لێدرا بوو. زۆربەی منداڵەـ
کان چووبوونە کـــــلاس و
هێندێکیشیان لـــە دەرێ
مابوونەوە . نەم دەزانـــی
روو دەکوێ کەم بە پرسیـــار
کلاسی پێنجەمی سەرەتـــاییم
دیتەوە و بەپارێزەوە وەژوور
کەوتم، پڕ بوو لە منداڵـــی
هاوتەمەنم بەڵام ئەوان دەگەڵ
من زۆریان جیاوازی هەبـــوو.
ئەمن کۆتێکی کۆنـی قـــورس
لەبەردا ، جووتێک چەکمـــەی
بڵیند لە پێ دا ، نایلۆنێکی
بۆری چڵکنی لە کتێب ودەفتەر
ئاخندرا و بەدەستەوە، ســـەر
تاشراو ( بێجگە لە چـەنـد
تووکی پێشەوە کە بە نێـــوی
شەرەف هێشتبومەوە ) بـــەڵام
ئەوان کەوشی تەوریز ،شەڵواری
شەق، کیفی سێ رەنگ وقەڵەمی
جوان و سەری شانە کـــراوە
کە ئەمنیان دیت تێکیـــــان
دەکوتا و دەیان گوت :

چاو گوند یە،
لەبەر گوێلکان راهاتووە
کاکۆڵیشی هێشتۆتەوە
چاوی لێکە ...

بەو قسانە مچوڕکم بـــە

کەوشم بۆ بکرە .
ی گوتی :
نارۆڵە خۆ ئەمن هـــەر

لەش داهات و نەم دەزانی لە
کوێ و لە کن کێ دانیشم.
هەروا چاوم دەگێڕا کە لە پڕ
لە قوژبنی کلاس چاوم بە
کوڕێکی کزی جلک شڕ کەوت
کە بە تەنیایی لە سەر
کورسیلەیەک دانیشتبوو. دڵم
گەش بۆوە و بێ دوو دڵی
ڕاست بۆ لای چووم سڵاوم لێکرد
و لە لای دانیشتم و زۆر بە
گەرمی وڵامی دامەوە و کوتی
لە کێهە گوندی ڕاهاتووی
گوتم لە ( س ... ) ڕا زۆری بە
خێرهاتن کردم و گوتی ئەمن
سوارەم،کە بۆر و چڵکنێکی
خۆم ئاسایی دیت حەسامەوە
هەروا دەگەڵ خەیاڵ و بیرمدا
دەخولامەوە. هەوەڵ ڕۆژی
مەدرەسەی ساڵی پێشووم وەبیر
دەهاتەوە کە مامۆستا هاتبۆ
گوند و قوتابیەکانی لە
وەتاغێکی چکۆلەی ماڵە کوێخا
کە بە هەزار تکا و ڕەجا
هەستاند بووی خڕ کردبۆوە..
مەدرەسەکەمان دوو ساڵ بوو
لە بەر کۆنی رووخابوو و
ئێستا چانە کرابۆوە. ئەو
وەتاغەی تێشی دا بووین دەبا
هەموو جارێ دەگەڵ بارینی
بارانەوە سەربانی کەوین و
خوێ ی پێدا کەین وبیشێلین
هەتا دڵۆپەی نەکا .بەدەنگی
پێی منداڵەکان کەلەپێش
مامۆستا هەستابوون وەخۆ
هاتمەوە. مامۆستا پاش
ئەوەی کە ناوی یەکریەکی
ئێمەی پرسی رووی لە تەختە
سیا کرد و خەریکی نووسین
بوو پاشان رووی لە ئێمە
کرد و گوتی بۆ ئەوەی بزانم
دەرسی ساڵی پێشووتان لە
بیرە یا نا ئەو مەسەلەیەم
بۆ نووسیون کێ دەتوانێ حەلی
کاتەوە دەست هەڵێنێ.

پێم وابوو ئێستا چل
دەست بەرز دەبێتەوەوهەموویان
مەسەلەکە دەزانن هەر بۆیە
تا ئەو جێی دەم توانی خۆم
چکۆلە کردەوە و لە پشت
منداڵەکان خۆم مات کرد..
کلاس زۆر بێ هەست بوو بە
ماتەماتە چاوێکم لە
منداڵەکان کرد کەس دەستی
هەڵنەهێنابوو. چاوم لە
تەختەسیا کرد و مەسەلەکەم
خوێندەوە بۆم دەرکەوت کە
حەلی مەسەلەکە دەزانم بەڵام
نەم دەوێرا بچمە پێش تەختە
سیا و دەترسام ئەو مەسەلەیە
لە شاریدا وەکوو گوند حەل
نەکرێتەوە چونکە تا ئێستا
هیچی شارم نەدیتبوو وەگوند
بچێ! مامۆستا گوتی:ئێستا
کەکەس نازانێ بۆخۆم حەلی
دەکەمەوە . غیرەتم وە بەر
خۆم ناو دەستم بە ئاستەم
هەڵێنا . مامۆستا نەی دیت
و خەریک بوو بۆ خۆی حەلی
کاتەوە کە سوارە بانگی کرد
مامۆستا ئەوە دەزانێ .هەموو
منداڵەکان روویان تێکردم و
مامۆستا گوتی :

. وەرە پێش تەختەسیا .رەنگم
سوور هەڵگەڕا لاقم دەلەرزی ،
لە شەرمان ئارەقەم کرد و
دڵم بە توندی لێیدەدا ،
چوومە پێش تەختەسیا گەچێکم
هەڵگرت و نووسیم... تەواو
بووم و لە جێگای خۆمڕا وستام
نەم دەوێرا جارێکی دیکە
بیخوێنمەوە چونکە دەترسام
غەڵەتم حەلکردبێتەوە بەڵام لە
چەپڵەی مامۆستا وقوتابیەکان
ڕا بۆم دەرکەوت کە ڕاستم
حەل کردۆتەوە چوومە سەر
جێگاکەم و دانیشتم. سوارە
گەش ببۆوە و هەر بزەی دەهاتێ
و ئەگەر بۆ خۆشی زانیبای
هەرئەوەندەی پێخۆش دەبوو.
رۆژ بە رۆژ زیاتر شەرمم
دەشکاند و سوارەش شان بە
شانی من دەهاتە پێش . لە
نێوە راستی ساڵ دابوو رۆژێک
مودیر هاتە کلاس و گوتی
لە لایەن ئیدارەوە -
موسابەقەیەکی گشتیمان هەیە
و هەر کەس پلەی هەوەڵ
بێنێتەوە خەڵات دەکرێ .تەنیا
شەوێکم دەرفەت بوو. هەوەڵ
هاتنەوە لەو هەڵسەنگاندنە
ببوو بە ئارەزوویەک کە
تاوێکیش لەبیرم نەدەچوو،
لە ئێوارێ وە دەستم کرد بە
خوێندن . شەو داهات ومنیش
بێ و چان دەم خوێند لە
ناکاو بەرق کووژاوە ،
فانۆسێکمان لە گوندی
ڕاهێنابوو هەڵم کرد و لە
ژێر سۆی فانۆس دەستم کردبە
خوێندن . پێم وابووچوومە
تەوە گوند و لە ژێر چرای

گوند دانیشتووم بۆیە زۆر چاکتر حاڵی دەبووم. هەر لە حاڵی دەرس خوێندن دا ئاوزینگ بڕسیتان لێ بڕیم و خەوم لێکەوت . شەوێ لە خەویمدا: پلەی یەکەمم هێنا بووە . . دەستێک جل و بەرگی جوان و جووتێک کەوشی تەوریزیان بۆ کڕیبووم لە مەیدانی گەورەی شاردا کۆمەڵێکی زۆر لە خەڵک کۆ ببوونەوە،چەپکە گوڵێکی جوانیان لە ملم کرد بوو. منداڵەکانی گوندمان هەموو هاتبوون و بە شانازیەوە بە خەڵکیان دەگوت:

ئەوە گوندەیە
خەڵکی گوندی ئێمەیە
بابی شوانەودایکی نانکەر
ئا،ئا،ئەوە گوندەیی یە.

لە ناکاو لە خەو ڕاپەڕیم و تەماشام کرد درەنگە و بە پەلە بێ نان و چا خواردن بۆ لای مەدرەسە وەڕێ کەوتم و چوومە کلاس پاش ماوەیەک پرسیارەکانیان بۆهێنا وەڵامی زۆربەیانم دەزانی . وەڵامم دانەوە و وەدەرکەوتم پێم وابوو کە هەوەڵ دێمەوە لەو فکرە دابووم کە خەڵاتەکەم هەڵدەگرم و دەیبەمەوە گوند و پێشانی دایک و باب و منداڵەکانی دەدەم .بڵێی چ بێ؟ بریا پانتۆڵێک با، چونکە پانتۆڵەکەم سەرچۆکی دڕاوە، یا بریا جووتێک کەوش با و لەباتی ئەو چەکمە درێژانە دەبەرم کردبا ناوەڵڵا کۆت لەهەموان چاکترە چونکە ئەوەدەم نۆرەم بەو کۆتە فەقیرە دەکرد وجارجار دەمشوت . یا بەڵکووهەموانم بدەنێ چەند خۆش دەبووئەوەدەم ئەمنیش لە تەختی پێشێ دادەنیشتم .

. سێ ڕۆژ بە سەر چوو مامۆستا هاتە کلاس و گوتی نەفەری یەکەمی تەواوی کلاسەکان دیاری کراوەوسبەینی بەیانی خەڵاتیان دەردێتێ بەڵام لە کلاسی ئێوە دوونەفەر یەکەم هاتوونەتەوە ناوی من و سوارەی خوێندەوە و گوتی مودیر سبەینێ پێش بەش کردنی خەڵاتەکان پرسیاری زارەکی( شەفاهی) لە ئێوە دەکا هەرکامتان باشتر وەڵام دەنەوە یەکەم دەناسرێن .لە پاشان وەکوو تەواوی ئەو منداڵانەی کە هەوەڵ هاتبوو- نەوە یەکی نامەیەکیان وێ داین و گوتیان سبەینێ بە دایک و بابتان بڵێن لەو کۆ بوونەوەدا بەشداری بکەن ئەو نامەیەم زیاتر لە بیست جار خوێندەوە چوونکە بۆ یەکەم جار لە پێش ناوی باوکمدا دەم خوێندەوە ئاغای ... لە گوندەکەماندا منداڵی چکۆلەش هەر پێیان دەکوت " حەمە شوان"ئێوارێ دەگەڵ سوارە لە مەدرەسە وەدەرکەوتین .هەردووکمان بێدەنگ بووین ئەمن وسوارەلە مێژ بوو پێکەوە هەمبەرانێ* دەرسی بووین بەڵام ئەو جار دەگەڵ جارانی تر زۆری جیاوازی بوو ئەمن و سوارە هەردووکمان بە دڵ پێمان خۆش بوو ئەوەڵ بێینەوە . سوارە گوتی :

. ئەگەر ئەوەڵ هاتیەوە پێت خۆشە خەڵاتەکەت چ بێ؟

ئەمنیش خەونەکەم بۆ گێڕاوە و گوتم سوارە بۆخۆت دەزانی چەند لەو چەکمەدرێژە و کۆت و پانتۆڵە شڕە بێزارم. بەڵام ئەتو پێت خۆشە خەڵاتەکەت چ بێ ؟

. سوارە ئاخێکی بەتاسەوە هەڵکێشا و گوتی : ئەمن برایەکی لە خۆم چووکترم هەیە و ئەویش دەچێتە مەدرەسە ئێمە بە دوان کیفێکمان هەیە و بەیانان ئەمن دەی هێنمە مەدرەسە و پاش نێوەڕۆیان ئەو دەیبا . ئەمن پێم خۆشە کیفێکیان دابا مێ بۆ ئەوەی کە هەر دووکمان کیفمان هەبا و ...

. بەیانی چوومە مەدرەسە و لە دوورەوە چاوم بە سوارە کەوت پێکەوە چووینە کلاس و مودیر وەژوور کەوت و گوتی پرسیارێکتان لێدەکەم هەر کامتان وەڵامتان زانی بڵێن دەزانم و وەڵامی بدەنەوە . مامۆستا پرسیارەکەی ئێستا بە تەواوی لە زار نەهاتبۆ دەر کە هەر دووکمان یەکڕا گووتمان " نازانم !!! "

# جەدوەل

تێبینی : لەپڕ کردنەوەی ئەم جەدوەلەدا هەموو ئوسوولی ڕێنووسی کوردی بەپێی ڕێنووسی هەڵبژێردراوی ئەم گۆوارە ڕەچاو کراوە جگە لەوەی نیشانەی (٧) دانەنراوە . واتا ئەگەر بۆ وێنە وشەی ( شڕ، کوڵ، زۆر، شەڕ و . . ) ی تێدا بێ بە شکڵی ( شر، کول، زور ، شهر و. . ) دەنووسرێ .

١٥ ١٤ ١٣ ١٢ ١١ ١٠ ٩ ٨ ٧ ٦ ٥ ٤ ٣ ٢ ١

١- شێخی سەنعانی بەناوبانگە- ئیستلاحێکی ئەستێرە ناسی ٢- بەهار خێڵات رووی تێدەکا- ئێمەی بێگانە- ئازاوژیر ٣- سواغی پێ دەکرێ - دڵی شاعیر- خەمرەوێنی شوان ٤- قارەمانی بەناوبانگی چیرۆک بۆمنداڵان - دەشتێکی پڕ پیت لەناوچەی دیواندەرە کە زستانان بەفرێکی زۆری لێدەبارێ ٥- بەستۆی تاوانبار- تیتۆڵ تیتۆڵ - نیو سیە ٦- لەشکر وسپا- دراوی کۆبەی سیخمە ٧- باران دەمە قاڵە ٨- خۆشخوانی بەهار- کەلەزرا ووبزدیاو ٩- لە سوور بەجێ دەمێنێ- شارێکی بەناوبانگی کوردستانی تورکیا- دۆل ودەرەی نێوان دوو چیا ١٠- پاسەوانی سەر- باڵندەیەکی بەرزەفڕ - گەورە ١١- خاوەن وسێحەب - قورسایی - نادیار ١٢- دووتایی ودوولایی - یەکەم سوپێرنەوتکلیشی کووەیتی کە وەسەر مین پەڕی ١٣- هەنگەمەوهاوار - ئاواتی کۆسە- توورەکەیەک لەحەمام ١٤- ژیر وبەسەرنج - کارێکی سەخت و پڕ زەحمەتە وپیشەی زوربەی پێغەمبەرانی خوا بووە ١٥- رام ودەستەمۆ- شیلەی خەشخاش- لە پەنا ولە تەنیشت .

١- شوێنەوارێکی مێژوویی کوردستانە- خوو ٢- خاتوون زۆری پێ تێک دەچێ- بەیانی زوو ٣- واحیدی پووڵێک بوو- دەیهۆننەوە ٤- تا وتێ - یەک لەوانەی بە حەزرەتی عیسا خەیان بوو- سەر لێ شێواو وڕێ لێ هەتڵە بوو ٥- تامێکە- جێ ومەکان - رندوو وپزوو ٦- وەستای سنە- یەک لەپێغەمبەران - هەرکەس بەئی خۆی دەپێوێ ٧- تۆی ئینگلیسی - کوت وپچڕ- ئێلێکی گەورەی کورد دانیشتووی تورکیا وعێراق کەدراوسێی داسنی یەکانن ٨- بنەگیا- دەهێندەی واحیدی پووڵی ئێران - تەنیای بەراوەژوو ٩- ئاگالە خۆوژیر- ژێر ١٠- ژمارەیەکە لە لای برابێ مەگەر قەزا لەلای خودا بێ - کەوشەن ومەرز- ڕەنگێک بۆ ماین ١١- جێ پێ لەسەر بەفری نەشکاو- هەڵە- نیەی نابەجێ - نیوە کەوا- ١٢- ڕێباز وڕێگا- دڵۆپە- عیشوە- ئێلێکی بەناوبانگی کوردی شیمال ١٣- پێتەختی وێتنام- ئەوەندەئاوەکەدەستنوێژی پێ هەڵگیرێ ١٤- هوتێلی مەڕ- قەفەس- حوسێنی خۆمانە ١٥- لەولاڕا کاکۆڵی شێرە ئی ئازایان بەرزە زەوی ئاونەگر

## پڕکراوەی جەدوەلی ژمارە ١٦ ◄

لەنێو ئەو کەسانەیدا کەپڕکراوەی ئەم ژمارەی سروەمان بۆبنێرن، یەک کەس بەپێی پشک بەبەرەندە دەناسرێ. بەمەرجێک ئەم خاڵانەی خوارو لەبەرچاو بگرێ:

١- جەدوەلەکە بەخەتێکی خۆش بنووسرێ وا بێ پیتەکان بێنە خوێندنەوە .

٢- ئەسلی جەدوەلەکەمان بوبنیری لەکاغەزی دیکەدا بەشداری نادری.

٣- لانی زۆر پازدە رۆژ پاش دەرچوونی گۆوارپڕکراوەی جەدوەلەکەی ناردبێ.

٤- پڕکراوەی جەدوەلەکە هەڵەی تێدا نەبێ

جایزەی پڕکردنەوەی جەدوەل ساڵێک ئابوونمانی گۆواری سروەیە .

## دیاری

## مەتەڵ

سی سوار لەبەر
سوارێکی دەلەرزی

"..."

دارێکم هەیە لەدارێکی
هەموو لەرزی بەجارێکی

"..."

مردووی دەنگ گـەورە
بـروسـک و هـــەورە

"..."

کۆڵەوەژی گیان کێشانێ
دۆست ودوژمنی نازانـێ

"..."

تاجی رەشەی دمهەراسێ
خێووخاوەنی ناناســێ

"..."

بۆخۆی بێ گیانە
لەگیاندا ردەگەڕێ

"..."

# پەندی پێشینان

ئەگەر دونیا بڕۆدا هەڕە
نادە گووزەکاوی .
تشتا کو بۆمالێ رەوایە
بۆ مزگەفتێ حەرامە (هندی
بۆمالە ،مزگەفت بەتالە)
ئەگەر لای لایێ دزانی
چما ناڕازێی ؟
پێنج تلی یێ دەستا
نەوەکی هەڤن .
هیم کری یا هیمنەکن،ئەگـــەر
وەهیم ژی کر بیر نەکن.
هەسپێ بەزا جەهێ خو زێدە
دکە .
تو ل ژێرێ روونشتی ، ل
ژۆرێ نەئاخڤە .
گەمی بێدا روونشتیەورووێ
گە میوان رادگرە
روونێ رژیایی چرالغە .
هەسپێ دیاری،ل ددانـــــا
نانێرن .
سەخایێ خۆ ناس دکە.
خەمێ خشتێ دپچ پچە،
حەوت شووکری هێتشتا کچە .
دەردێ بێ براتیێ، برامری
دزانە .
برابرایە ،بازار جودایە
ل کیسکێ خوە مێزەکە پاشێ
مستێ تێڕاکە .
دوبرا پێکڤە ناچن گۆرەکی.
بزن ژی مەغەلێ خۆ پێکۆل
دکە پاشێ مەغەل تێ.
بزنا گوڕی ل سەرەکانی یێ
ئاڤێ ڤەدخۆ.

* هۆڕە کۆن باسیان نەدەکرد
دەیگوت من چل مەن دەگرم.
* قسەی ساغ لەچەنەی شکاو
دێتەدەر.
* گۆم تاقووڵ بێ مەلـەی
خۆشترە .
* کەس لەپڕێک نـابێتـــە
کوڕێک .
* خودا کە غـەزەب لــە
مێروولە بگرێ باڵی دەداتێ.
* ریش نەبێ بەکۆڵتەوە کە
بوو دەبێ شانەی بۆهەڵگری.
* پیاو کۆڵەکەی ماڵە .
* کە کەس لەماڵ نـەبێ ،
رەجەب سەرپاڵەیە .
* هاوین دەگەڕێ خەرامانی
مەست ــ زستان دەگـــەڕێ
توورەکە بەدەست .
* قسە لەپاش حەوت کێـــو
دەگاتەوە بە خێو .
* هەموو کەس نانی خـــۆش
دەوێ بەڵام وەک شـــوان
نایگرێ بە دڵیەوە.
* کەچەڵ حەکیم بـــوایــە
سەری خۆی دەرمان دەکرد.
* سەرێک لەنێوان سـەران
نەبێ بڕینی چاکترە.
* گۆزە هەمووجارێ بەساخی
لە کانی ناگەڕێتەوە .
* شوێنێک مەلای لێ نەبـێ
بەکەڵەبابی دەڵێن بولقاسم.
* بە هەزار حەکیم بەقەرای
دەردەدارێک نازانن .

ژەنەڕاڵێک بە فیس و
ئیفادە بەشەقامدا دەڕۆیشت.
سەربازێک لەسەرەخۆ بۆ
ئەوەی سڵاو بکا بەتەنیشتیدا
هات وسڵاوی نەکرد.
ژەنەڕاڵ بە تووڕەیی رووی
کردە سەرباز وپرسی:
- "سەرباز بڵێ بزانم
ئەگەر ژەنەڕاڵێک وسەربازێک
لە شەقامدا تووشی یەک
بن کامیان دەبێ لەپێشدا
سڵاو بکا ؟!"
- قوربان ئەوەی بە
ئەدەب تر بێ !

لە گوندێکدا هیچ کەس
چەقۆی نەدیبوو. رۆژێک
کابرایەک چەقۆیەکی لە
ئەردی دەبینێتەوە. نازانێ
چیە .دەیباتە لای کوێخای
دێ ولەوی دەپرسێ کوێخا
گیان بەقوربانت بم بزانە
ئەوە چیە ؟
کوێخا پاش تێڕوانینێکی
زۆر دەڵێ :
" کوڕە ئەوە فەرخە
مشارە هێشتا ددانی
نەهاتووە . "

کابرایەک بەدۆستەکەی
گوت خێزانم سێ منداڵی
بەزگێک بووە و لە کاتی
منداڵ بوونیدا کتێبی
«سێ تفەنگداری»دەخوێندە-
وە" دیارە ئەو کتێبە
کاری خۆی کردووە.
دۆستەکەی لەوەڵامدا کوتی:
-" ئەگەروایە دەبێ
شوکری خودای بکەی کە
کتێبی «چل تووتی»بەدەستەوە
نەبووە ا".

جارێک کابرایەک دەچێتە
فەرمانداری بۆ وەرگرتنی
کارتی سکوونەت . پێی
دەڵێن کاکە دوو قەتعە
عەکس بدە کارتت بدەینێ.
ئەویش بە سەرسوڕماویەوە
مەحتەل دەمێنێ و هیچ
عەکسی پێ نابێ. روو لە
کابرایەکی تەنیشتی دەکا و
دەڵێ :
-" کاکە خۆدنیا خرا
بوون نیە ئەتۆ دووعەکسم
بە قەرز بدەیە دوایە دوو
عەکسی خۆمت وێ دەدەمەوە!"

●●●

کابرایەک شووژنێک لەسەر
رێگا دەبینێتەوە ونازانێ
چیە. دەیباتەوە ئاوایی و
خەڵکی لێ کۆ دەکاتەوە
کەس نازانێ چیە. کوێخا دێ
بانگ دەکەن ولێی دەپرسن
ئەوە چیە. کوێخا برێکی
تێوەرا دەمێنێ ودەڵێ :
" باوکم تاکەی بۆئێوە
بژیم. بۆهیچ فێر نابن .
ئەمە بەچکە گاسنە وچاوی
نەپشکوتووە !"

هەواڵنێری رۆژنامە لە
کابرایەکی پرسی :
" ئاغا لە شاری ئێوە
ئاسەواری کۆن ( آثار
باستانی) هەیە ؟
جوابی داوە:
" نەخێر خەریکن بۆی
ساز دەکەن !"

# فەرهەنگۆك

**تەوژم** :فشار ،هێرش .

**بایەخ**:بایی،بەها ، (ارزش)

**رمووزن**:دێوەزمە ،هەیوولا

**بنەما** :بنەرەت،ریشە

**کەلەپوور** :میراتەبەتایبەتی میراتی فەرهەنگی مێژوویی.

**نەتەوی**:دوژمن،بێگانە ،لاوەکی

**سترا ن**:گۆرانی،ترانە .

**هەلوێژاردن**:لێک جیاکردنەوە .

**ئیشکارو** :قاقر،بیروون،بۆ ئاو

**مخترع** :داهێنەر،دروست کەری شتی تازە.

**هەس دانەوە** :گیرانەوە،پێش پێگرتن وگەراندنەوە.

**آبگرمکن**:ئاوگەرمکەر،ماشینی ئاوگەرمکردن لەمال وحەمامدا

**خورشید** :رۆژ.

**نوێنگە** :نومایشگاە،جێگەی نواندن ونیشان دان .

**ئوجاغ،(اجاق)** :ئاورگ .

**شە** :نم،رتووبەت .

**تایەن،دایەن**:ئەوژنەی کە مندال بۆژنی دیکە بەخێو دەکا.

**هۆدە** :وەتاغ، ژوور.

**جووقە (جوقە)** : ئەستێرەی شانی ئەفسەرلەنیزامدا .تاج

**فەرەی ئیزەدی**:جەلال وشکۆی، خودایانە ،تاجی گەورەیی.

**ئاودامێن**:درێژەتاسەرعەرزی.

**تەیمان**:پەرژین،حەسار ، دیوار.

**یاو** :نۆبەتێ،تەب ،تاووتێ

**ماسین**:هەلمسان،باکردن،هەلتۆقین .

**بەلم** : لۆتکە

**سەول**:پاروو.

**هەگەر** :هۆ،سەبەب .

**درنج**: دێو ، دێوودرنج.

**رۆندک** : ئەسرین،فرمێسک، هیسر

**ئەوک**: گەروو،قرقرۆچکە .

**هەژدەر هەژدەرقسەکردن**: توند توندقسەکردن .

**فیلەنتەر** :زەبەلاج،زۆرزەلام.

**حەساس** :کێشکچی شەوانەی نێوبازار.

**لەجەر** :کزولەروباریک

**هەمبەران**:رەقیب .

**کەلەزراو**: ترسەنۆک، ترساو

**گۆخل**: وەستای چەلتووک

**باسترغە** : بۆ ئەوە کە برینج چەقەرە بدا لەئاوی دەکەن کە بەمکارە دەلێن باسترغە .

**پاستاو** :هەوەلین ئاو.

**تالخۆش** : رۆژو دانێک ئاو لە برینج دەگرنەوە و پێی دەلێن تالخۆش کردن.

**جلە**: ملۆزمی برینج .

**سندەپێدان**: چرژ دانی زەوی .

**پێتاو**: میراوی برینج.

**پایە** : شێلەگەی بچووک

**مارەگوێز** :تیرەی درێژی ئاو کە ئاوی پیدا دەچێتە گۆلاو

**چەنبەر** :پێکەوەنانی باقەی چەلتووک .

**خوونەدان**: چەقاندنی باقە .

**کۆلنەمە** :کوتانی هەوەل جاری برینج لەدینگێدا .

**قەرەنیمە** :دووەمجار .

**گۆخلانە** : هەقی وەستای چەلتووک .

**قەرەنیمەی دوانێ**: ئاخ نیمە= ئاخرین کوتان .

**هینگ** :نرکەی هەناسەی دینگ، لێدەر.

**پاکانە** : تەوجیە .

**گزە** : فیل .

**تەڤیتە** : دەڤیتە ، دەیەوی

**نەختە** : نختە ، بارش .

**تکە** : دکە ، دەکێ .

**رابوون**: هەستان .

**هزر** : فیکر .

**بیچی** : بیچکە کەو، بار.

**هەڤرک** : جگر.

**هەوە** : وە،ئیوە، هونگو ، هونگ .

**شیان** : کارین ، تواست .

**ئاستەنگ** : بەغلەجی،تەنگ .

**نتلاندن** : نتراندن،نەقشاندن ( نووسین)

**ویج**: واج ،وەج، بەهرە .

**پیت** : حەرف .

**راچافکرن**: بەرچاو گرتن پاراستن .

**ئالوزی**: تیکەل پێکەلی .

**ساناهی**: ئاسان، هیسان .

**بلی**: بلوو، خەین ژ.

**زاراوە**: لەهجە .

**بیهانی**: دەرەکە، مەدەر ،، بیگانە.

**بەرسف** : جەواب .

رۆژنامە

کاری: محەمەد ناهیدسەقز

مامە پیرەی تامەزرۆ

دیاری: خالیدسەباغی سەردەشت

باغی میراوای بوکان

دیاری سابیرمووسازادە

گۆلی تاق بوستانی کرماشان

دیاری گۆواری سروە

چیاکانی هەڵزانی بانە

دیاری حوسێن حوسێنی